






# هەندێ لایەنی ڕستەسازی زمانی کوردی


پ.ی.د.ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی
کۆلێژی زمان/ زانکۆی سەلاحەددین


هەولێر- ٢٠١٣



* ناوی کتێب: هەندێ لایەنی ڕستەسازی زمانی کوردی.

* نووسەر: پ.ی.د.ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی.

* بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود .

* نەخشەسازی: عیسام موحسین.

* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(١٩٣).

* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٣١)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

# پێشەکی

زمان(ئاخاوتن) چالاکییەکی سروشتی هەموو مرۆڤەکانە. بەڵام ئەم چالاکییە لە سەرکۆمەڵێ یاسا و ڕێسا و ڕۆنانی تایبەت بە زمانێك دامەزراوە. لە هەر زمانێکدا، ریزبوونی مۆرفیمەکان/ وشەکان لە زنجیرەی ئاخاوتندا بۆ پێکهێنانی یەکەی گەورەتر بە پێی هەندێ یاسا ڕۆدەنرێ کە ڕستەسازی پێدەڵێن. دیارە بابەتی لێکۆڵینەوەی ڕستەسازیش" ڕستە" یە. هۆی پێویستیمان بە ڕستەسازیی و تاوتوێکردنی ڕستە، تایبەتمەندیی ئاسۆیی وریزبوونی کەرەستەکانێتی بە شێوەیەکی هێڵی و یەکلایەنە لە رەوتی زماندا. چونکە هەر زمانێك دەیەوێ پەیوەندی نێوان پێکهێنەکانی ڕستە بە پێی سنووری دەسەڵات و یاساکانی خۆی دیاری بکات. بۆیە دەبێ لەو بنەمایانە بدوێین کە ڕستە لە زمانێکی تایبەتی وەك زمانی کوردیدا لە سەریان دادەمەزرێ.": ئەوە کە وشەکان چۆن پێکەوە کۆدەبنەوە بۆ پێکهێنانی گرێ و ڕستەکان" .

هەندێ کەسیش زاراوەی "رێزمان" بە هەمان واتای ڕستەسازی بەکاردێنن، هەر چەند زۆربەی زمانەوانان لەم شێوازەی دواتریان پەیڕەوی دەکەن، کە بە هۆیەوە ڕێزمانی زمانێك هەموو بنەماکانی سیستەمەکەی دەگرێتەوە: زانیاری لە بارەی پێڕەوی دەنگەکانی، لە بارەی فۆرمی وشەکان و لەبارەی ئەوەی کە ئێمە چۆن زمان لەگەڵ دەوروبەردا یەکدەخەینەوە و....، رستەسازی تەنیا بەشێکە لەم رێزمانە.

لێرەدا ئێمە دەمانەوێ دەریبخەین کە زمانی کوردی چۆن ڕستەکانی ڕێکدەخات، واتە سنووری تاوتوێکردنەکەمان چۆنێتی "پۆلکردنی وشەکان" و ڕیزبوونیان لە "گرێ" و"ڕستە" کاندا دەگرێتەوە. مەبەست ئەوەیە کە یارمەتی خوێنەر بدەین بۆ تێگەیشتنی لەوەی کە ڕستەسازی چۆن لە زماندا ئیش دەکات و لەگەڵ ئەو چەمکە گرنگەی ڕستەسازی و زاراوە تەکنیکیانەش ئاشنا بکەین کە لەم بە شەی ڕێزماندا بەکاردێن، وەك:" پۆلە فۆرمەکان،ڕستە، گرێ، بکەر، بەرکار، سەربار، ئاوەڵگوزارە، تەواوکار و....." .

# ڕستەسازی

**سەرەتا**

سینتاکس (syntaxis) وشەیەکی یۆنانییە، کە لە دووبەشی "syn" بە واتای "پێکەوە" و"taxis" بە واتای "ڕێکخستن" و" دانان" دێت،پێکهاتووە، کە لقێکی ڕێزمانە ئەرکی گرنگی ڕێکخستنی وشەکانە لە ناو ڕۆنانێکی گەورەتردا، بەتایبەتی لە چوارچێوەی ڕستەدا، کە هاوتایە لەگەڵ تاوتوێکردنی پێکهاتە و ڕۆنانی ڕستە، بە واتایەکی تر یەکێك لەو یەکە بنچینەیی و سەرەکییانەی، کە ڕێزمان خۆی پێوە خەریك دەکات و گرنگی پێدەدات ڕستەیە، چونکە کاری ڕێزمانە کە دەڵێ پێکهێنەکانی ڕستە چین و چۆن کار لەیەکتری دەکەن و بە چ شێوەیەك ڕیزدەبن، کەواتە، ڕستە بڵاوترین دانەی زمانی گەورەیە کە زۆربەی زمانەوانەکان دانی پێدادەنێن و دەیناسنەوە و باوەڕیان وایە کە دەتوانێ چاری ڕۆنان و پۆلە ڕێزمانیەکان بکات[1]. کاتێ ئێمە لە ڕستە ورددەبینەوە، دەبینین وشە پێکهاتەیەکی ڕاستەوخۆی ڕستە نییە، بەڵکو وشە دوا پێکهێنی ڕستەیە، چونکە وشەکان بۆ ڕۆنانی گەورەتر لە ڕستەدا ڕێك دەخرێن،ئەویش گرێیە، بەم جۆرە گرێ پێکهێنێکی ناوەندییە و دەکەوێتە نێوان وشە و رستەوە، لە رووی ڕۆنانەوە گرێ لە وشە گەورەترەو لە ڕستەش بچووکترە، واتە گرێ لە وشە پێکدێت و ڕستەش لەگرێ. ڕۆنانی ڕستەی زمانی کوردی بە شێوەیەکی هەرەمی لە چەند پێکهێنێك دروستبووەو هەریەکێك لە پێکهێنەکانیش کە پۆل (کەتیگۆری) هەیە. هەرچەندە کە وشەکان پێکهێنە ڕاستەوخۆکانی ڕستەکان نین ، بەڵام ڕۆڵێکی گرنگ وەك دوا پێکهێن لە ڕۆنانی ڕستەدا دەبینن. بێگومان ئەو زانیارییە فەرهەنگییانەی وشەش ڕۆڵێك لەڕۆنانی ڕستەدا دەگێڕن، چونکە پۆلی سینتاکسی وشەیەك جۆری دابەشبوونی وشەکەش دیارو دەستنیشان دەکات[2]. پێکهێنەکانی ڕستە لەم هێڵکارییە ی خوارەوە روون دەبێتەوە:

---

[1]– محەمەد مەعرووف فەتاح،١٩٩٠، ل٩٨.

[2]– حاتەم وەلیا محەمەد، ٢٠٠٠، ل٢٧.




## پۆلە فۆڕمەکان:

سەرەتای بیرکردنەوە لە زمان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گریکەکان، بە تایبەتی بۆ بەشێك لە گفتوگۆکانی ئەفلاتوون. ئەفلاتوون بەیەکەم ڕێزماننووس دادەنرێ، چونکە یەکەم کەس بووە کە گوتوویەتی ڕستە لە دوو بەش پێکدێت، ئەویش(ناو وکار)ە. کەواتە ئەم دابەشکردنەی ڕستە بۆ پۆلە فۆڕمەکان هەر لە زەمانی ئەفلاتوون و ئەرستۆوە دەستی پێکردووە و هەبووە. ڕێزمانی دێرین پۆلە فۆڕمەکانی دابەشی سەر هەشت جۆر کردووە و پێناسەیەکی سادە و ساکاریانی کردووە، کە بۆتە جێگای ڕەخنەی ڕێزمانی نوێ، چونکە ئەو پێناسانەی کە بۆ پۆلە فۆڕمەکان کراون، هەندێکیان بەندن بە سینتاکس و هەندێك بە واتا و هەندێکیش بە هەست و سۆزەوە بەند نین بەیەك بنەما. هەروەها پێناسەکان ناڕێزمانین و بە کەڵکی زمانێکی دیاریکراو نایەن . پێناسە دەبێت بەند بێت بە ڕەوشت و ڕەفتاری وشەکانی ڕستەوە لە زمانێکدا. بۆ نموونە دەتوانین بڵێین" ناو" ئەو وشەیە کە دەتوانێ (ەکە، ێك، ان) وەربگرێت.کەچی "ئاوەڵناو" ئەو وشەیە کە دەتوانێ (تر، ترین) وەربگرێت. لە کاتێکدا کار هەندێ پێش کار (هەڵ، را، دا، رۆ..) و پێشگری

(دە، ب) لەگەڵدا دەبینرێ کە هەرگیز ئەمانە لەگەڵ ناودا نایەن. فۆڕمەکانی تریش بەهەمان شێوە...

## بنەماکانی جیاکردنەوەی پۆلە فۆڕمەکان:[1]

زمانەوانی نوێ(٣)سێ بنەما دادەنێت بۆ جیاکردنەوەی پۆلە فۆڕمەکان، مەرجیش نییە ئەم بنەمایانە هەموویان لە یەك پۆلە فۆرم کۆببنەوە ، بەڵکودەتوانرێ بە یەکێك لەم بنەمایانە پۆلە فۆرمەکان دیاری بکرێت. بنەماکانیش ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم/ بنەمای مۆرفۆلۆجی بریتییە لەمانە:

١- گیرەکی رێزمانی: وشە لەرووی فۆڕمەوە بە ناو دادەنرێت ئەگەر بتوانێت گیرەکی رێزمانی (ەکە، ێك، ان) وەربگرێت وەك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| پیاو | پیاوەکە | پیاوێك | پیاوەکان |
| پەنجەرە | پەنجەرەکە | پەنجەرەێك | پەنجەرەکان |
| گوڵ | گوڵەکە | گوڵێك | گوڵەکان |

وشە لەرووی فۆڕمەوە بەئاوەڵناو دادەنرێ ئەگەر بتوانێت گیرەکی رێزمانی (تر، ترین) وەربگرێ وەك:

| | | |
|---|---|---|
| زیرەك | زیرەکتر | زیرەکترین |
| باش | باشتر | باشترین |
| جوان | جوانتر | جوانترین |

وشە لەرووی فۆڕمەوە بەکار دادەنرێت ئەگەر بتوانێت گیرەکی رێزمانی (ئەسپێکتەکان) (دە ، نە، نا، مۆرفیمی رابردوو، رانەبردوو، جێناوە لکاوەکان) وەربگرێت. وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| چوون | دەچم | نە چووم | ناچم |
| کڕین | دەکڕی | نەی کڕی | ناکڕی |

[1]- محەمەد مەعرووف فەتاح، موحازەرەکانی خوێندنی باڵا(ڕستەسازی)، ماستەر، ١٩٩٧.

خوێندن دەخوێنن نەیان خوێند ناخوێنن

٢- گیرەکی دارشتن: وشە لەرووی فۆرمەوە ئەگەر گیرەکی دارشتنی (ی، ە، ستان، گە/گا،.....هتد) وەربگرێت ئەوە دەبێتە ناو وەك:

جوان + ی = جوانی

تاریك + ی =تاریکی

چاك + ە = چاکە

ڕاست + ە = ڕاستە

کورد + ستان = کوردستان

گوڵ + ستان = گوڵستان

سەیران + گا = سەیرانگا

جێ + گا = جێگا

وشە لەرووی فۆرمەوە بەهۆی گیرەکی دارشتنی (ن، ین، انە، ...هتد) دەتوانرێت ئاوەڵناوی لێ دروست بکرێ وەك:

شەرم + ن = شەرمن

ورگ + ن = ورگن

ئاگر + ین = ئاگرین

زێڕ + ین = زێڕین

ژن + انە = ژنانە

پیا + انە = پیاوانە

کار لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی گشتی گیرەکی دارشتن لە شێوەی پێشگر(هەڵ، ڕا، دا، ڕۆ، ....هتد) وەردەگرێت وەك:

هەڵ + گرت = هەڵگرت

هەڵ + چوو = هەڵچوو

ڕا + ماڵی = ڕاماڵی

ڕا + گرت = ڕاگرت

دا + خست = داخست

دا + گرت = داگرت

ڕۆ + کرد = ڕۆکرد

ڕۆ + چوو = ڕۆچوو

دووەم/ بنەمای ڕستەسازی بریتییە لەمانە:

١- شوێنی پۆلە فۆرمەکان لە ڕستەدا: بەشێوەیەکی گشتی پۆلی وشە دەتوانرێت بەهۆی شوێنەکەیەوە بناسرێتەوە، بۆ نموونە زۆربەی کات ئەو وشەیەی دەکەوێتە سەرەتای ڕستەوە ناوە، وەك:

- منداڵەکە وەستاوە.
- کۆترەکە فڕی.

هەر وشەیەك بکەوێتە دوای جێناوی نیشانە، دەبێت ناوبێت و پاشبەندی هەبێت وەك:

- ئەو پیاوە
- ئەو ژوورە

بەڵام وشەی (زۆر) هەمیشە لە ناو ڕستەدا ئاوەڵناوی لە دواوە دێت وەك:

- زۆر خۆش
- زۆر جوان
- زۆر ڕێك

٢- ئەرکی پۆلە فۆرمەکان لە ڕستەدا: دەتوانرێت پۆلە فۆرمەکان بە ئەرکیان دیاری بکرێن بۆ نموونە بە شێوەیەکی گشتی ناو لە ڕستەدا ئەرکی بکەر و بەرکار دەبینێ، ئاوەڵناویش ئەرکی دیارخەر دەبینێ لە ڕستەدا ،کاریش ئەرکی کاردەبینێ لە ڕستەدا پۆلە فۆرمەکانی تر بە هیچ شێوەیەك ئەم ئەرکە نابینن وەك ئەم نموونانەی خوارەوە دەری دەخەن:

- منداڵەکە هات.

ناوە/ بکەرە

- بەردەکە پەنجەرەکەی شکاند.
ناوە/ بەرکارە
- قوتابیە زیرەکەکە بەیەکەم دەرچوو.
ئاوەڵناوە/ دیارخەرە
- نامەکەم خوێندەوە .
کارە/ کارە

سێیەم/ بنەمای فۆنۆلۆجی(هێز):

پۆلە فۆرمەکان دەتوانرێن بە هۆی هێزەوە بناسرێنەوە، بۆ نموونە ئەگەر وشەکە ناو بێت هێز هەمیشە دەکەوێتە کۆتایی وەك:( مامۆستا`، کوردستا`ن، دا`ر.....هتد) بەڵام لەکاردا هێز دەکەوێتە سەرەتاوە وەك (دە`ڕوات، دە`خوات، چوو`م....هتد)

**پۆلە وشەکان:**[1]

وشەکان لە زماندا دابەشی سەر دوو پۆل دەبن، ئەویش (پۆلی کراوە و پۆلی داخراو)ە:

١- پۆلی کراوە: مەبەست لەم جۆرە پۆلە لەزماندا ئەوەیە کە دەتوانرێت وشەی تر دروست بکەین و واتای فەرهەنگی و پێناسەیان هەیە، بۆ نموونە (ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، کار) بەپۆلی کراوە دادەنرێن، چونکە دەتوانین چەندەها جۆر لە مانە دروست بکەین و ڕۆژانە دروست دەبن، واتە ئەمانە کراوەن بە ڕووی گۆڕان و وەرگرتنی وشەی نوێ بۆ ناو پۆلەکەی خۆیان.

٢- پۆلی داخراو: مەبەست لەم جۆرە پۆلە لەزماندا ئەوەیە کە ناتوانرێت وشەی تریان لێ دروست بکرێن و داخراون و زیاد ناکرێن و پەیڕەوێك

[1]- محەمەد مەعرووف فەتاح، موحازەرەکانی خوێندنی باڵا (ڕستەسازی)، ماستەر، ١٩٩٧.

دروست دەكەن و پێناسەی یەكتر دەكەن، واتای فەرهەنگییان نییە، واتاكەی لە بەراورد دایە لەگەڵ ئەوانی تردا، بۆ نموونە (جێناوی نیشانە، جێناوەكان، ئامرازەكانی پەیوەندی،) بە پۆلی داخراو دادەنرێن، چونكە ژمارەی وشەكان سنووردارە و زیاد ناكرێن، وەك:

- جێناوی نیشانە {ئەم...... ە ، ئەم.......انە} – ئەم قوتابییە، ئەم قوتابییانە
{ئەو...... ە، ئەو....... انە} – ئەو كتێبە، ئەو كتێبانە

- جێناوی سەربەخۆ{من ، ئێمە }
{تۆ ، ئێوە }
{ئەو ، ئەوان}
- جێناوی لكاو أ– (كۆمەڵەی خاوەنێتی): { م ، مان}
{ت ، تان}
{ی ، یان}
ب– (كۆمەڵەی ڕێككەوتن): { م ، ین}
{(ی (یت))، ن}
{(□، ێ (ێت)، ا(ات))، ن}
- ئامرازی پەیوەندی { بە، لە، بۆ}

## گرێ و جۆرەكانی

گرێ:

بەو یەكە سینتاكسییە دەگوترێت كە لە كەرەسەیەك، یان لە كەرەسەیەكی سەرەكی (سەرە) و هەموو ئەو كەرەسانەی كە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ (دیارخەر) بەندن پێوەی، یان لە ژێردەسەڵاتیانن پێكدێ و لەڕستەدا ئەركێك دەبینێ. گرێش بە پێی جۆری كەرەسە

دروست دەکەن و پێناسەی یەکتر دەکەن، واتای فەرهەنگییان نییە، واتاکەی لە بەراورد دایە لەگەڵ ئەوانی تردا، بۆ نموونە (جێناوی نیشانە، جێناوەکان، ئامرازەکانی پەیوەندی) بە پۆلی داخراو دادەنرێن، چونکە ژمارەی وشەکان سنووردارە و زیاد ناکرێن، وەک:

- جێناوی نیشانە {ئەم...... ە ، ئەم.......انە} — ئەم قوتابییە، ئەم قوتابییانە

{ئەو...... ە، ئەو....... انە} — ئەو کتێبە، ئەو کتێبانە

- جێناوی سەربەخۆ{من ، ئێمە }

{تۆ ، ئێوە }

{ئەو ، ئەوان }

- جێناوی لکاو أ– (کۆمەڵەی خاوەنێتی): { م ، مان}

{ت ، تان}

{ی ، یان}

ب– (کۆمەڵەی رێککەوتن):{ م ، ین}

{(ی (یت))، ن}

{(□، ێ (ێت)، ا(ات))، ن}

– ئامرازی پەیوەندی { بە، لە، بۆ}

## گرێ و جۆرەکانی

### گرێ:

بەو یەکە سینتاکسییە دەگوترێت کە لە کەرەسەیەك، یان لە کەرەسەیەکی سەرەکی (سەرە) و هەموو ئەو کەرەسانەی کە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ (دیارخەر) بەندن پێوەی، یان لە ژێردەسەلاتیانن پێکدێ و لەڕستەدا ئەرکێك دەبینێ. گرێش بە پێی جۆری کەرەسە

سەرەکییەکە (سەرە) دەتوانرێ چەند جۆرێکی لێ دەستنیشان بکرێ وەك(گرێی ناوی، گرێی ئاوەڵناوی، گرێی بەند، گرێی کاری...)

**تایبەتییەکانی گرێ**

گرێ بە شێوەیەکی گشتی چەند تایبەتییەکی هەیە لە وانە:

١- گرێ لە رووی ڕۆنانەوە لە ڕستە بچووکترە، بەوەی کە شوێنی ڕۆنانێکی نزمتر لە ڕستەدا دەگرێت و لە وشەش گەورەترە، بەوەی کەوا شوێنی ڕۆنانێکی بالآتر لە وشە دەگرێت.

٢- گرێ دەتوانرێ فراوان بکرێ، بە هۆی کەرەسەی ترەوە، یان کورت بکرێتەوە بۆ تاکە وشەیەك، هەندێ جاریش دووگرێی سادە، یان زیاتر یەك دەگرن و گرێیەکی لێکدراو دروست دەکەن، بە تایبەتی لە گرێی ناویدا.

٣- ئەو گرێیەی لە کەرتێك زیاتر پێکدێت، دەبێ کەرتەکان بە هۆی یاسایەکی سینتاکسی لێك درابن، واتە لە کاتی لێکدانی دوو کەرەسە، یان زیاتر جۆرێك لە پەیوەندی سینتاکسی لە نێوان کەرتەکان پەیدادەبێ. هەموو کەرتەکان بە هاونرخی ڕێزمانیان نابێت، بەڵکو کەرەسەیەك تێیاندا دەبێ بە(سەرە) وئەوانی تردەبن بە دیارخەری سەرە.

٤- گرێ یەکەیەکی سەربەخۆیە لە ڕەفتاردا، کە دەگوازرێتەوە بۆ پێشەوە، یان دواوە ڕستەکە تێك ناچێت، واتە کەرتەکانی گرێ هەموویان پێکەوە دەجووڵێن نەك یەکێك لە کەرەسەکان بگوازرێنەوە و لە ڕستەدا پاش و پێشیان پێ بکرێ.

٥- گرێ لە ڕستەدا ئەرك دەبینێ جا ئەم ئەرکە سەرەکی بێت، یان ناسەرەکی وەك(بکەر، بەرکار، تەواوکار، سەربار، ئاوەڵگوزارە، کار ...)

جۆرەکانی گرێ:

گرێ بە پێی جۆری سەرە(دیارخراو)ەکە چەند جۆرێکی هەیە لە وانە:

**یەکەم/ گرێی ناوی:**

بریتییە لەو پێکهاتەیەی کە سەرەکەی ناوە، یان ناو ئاسایە وەك جێناو، ئەم سەرەیە بۆی هەیە بە هۆی دیارخەرێکەوە، یان چەند دیارخەرێکەوە فراوان بکرێت کە دیارخەرەکان، یان دەکەونە پێش سەرە، یان دوای سەرە.[1] لە گرێی ناویدا هەموو کەرەسەکان لە ژێر دەسەلآتی ناوەکەدا دەبن، هەرچەندە بە شێوەیەکی گشتی ناو دەوری سەرە دەبینێ، بەلآم بەشەکانی تری ئاخاوتنیش( ناوئاسا) دەتوانن ئەم دەورە ببینن لە گرێی ناویدا. وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- منداڵی برسی هەرگیز سەرما لە لەشی دەرناچێ.
- داربەڕووی کوردستان بەناوبانگە.
- ئێمەی چیایی لە بەفر دروست نەکراوین.
- یارمەتی دانی هەژاران کارێکی پێویستە.

گرێی ناوی لەرووی ڕۆنانەوە

گرێی ناوی لەرووی ڕۆنانەوە دەکرێت بە دوو جۆرەوە:

١- گرێی ناوی سادە: ئەم جۆرە گرێیانە دەگرێتەوە کە لە کەرەسەیەك یان لە سەرەیەك و دیارخەرێك، یان چەند دیارخەرێك پێکدێ. گرێی ناوی سادەش دوو جۆری هەیە:

أ- گرێی ناوی سادەی ناوك

ئەم جۆرە گرێیە لە زمانی کوردیدا لە ناوێك، یان ناوئاسایەك پێکدێت کە ناوك(سەرە)ی گرێکەیە[2] وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- ئازاد رۆیشت.

گ ن

---

[1]- ڤیان سلێمان حاجی، ٢٠٠١، ل٢٩.

[2]- تاڵیب حوسێن عەلی، ١٩٩٨، ل١٦ .

- ئەوان خواردیان
  گ ن
- نووستن خۆشە.
  گ ن

ب- گرێی ناوی سادەی فراوانکراو

ئەم جۆرە گرێیانە دەگرێتەوە کە سەرەکە دیارخەرێك، یان زیاتر لە دیارخەرێکی لەگەڵدا دەبێت، دیارخەرەکان لە گرێی ناویدا دەبن بە دوو کۆمەڵەوە:

١- دیارخەری پێش سەرە(بێ ئامراز):

لەم جۆرە گرێیەدا دیارخەرەکان پێش سەرە دەکەون بە بێ هیچ ئامرازێك، بەڵکو بە هۆی پەیوەندییەکی سینتاکسی لە یەك دەدرێت. ئەو کەرەسانەی کە دەوری دیارخەر دەبینن دەچنە پێش سەرە بریتین لە( مۆرفیمی هەر ، تەنیا، جێناوی نیشانە، ژمارە، مۆرفیمی پرس، رادە(چەندێتی)، نازناو، نەفی، ئاوەڵناوی پلەی باڵا....هتد) لەم نموونانەی خوارەوە رون دەبێتەوە:

- هەر کتێبێك بێنە.
- تەنیا قوتابیەك دەرچووە.
- ئەو گوڵە سیس بووە.
- دوو خانووی کڕیوە.
- چەند ژنێك هاتبوون.
- هەندێ شتم هێناوە.
- هیچ کەس ئامادە نییە.
- مامۆستا دلێر دامەزراوە.
- حاجی عەلی لە کۆڵانەکەی ئێمەیە.
- باشترین کتێبم هەڵبژاردووە.

مەرج نییە هەموو ئەو کەرەسانە لە گرێیەکی ناویدا بەسەر یەکەوە دەرکەون، بەڵام دەشێ دوو کەرەسە، یان زیاتر لەو کەرەسانە بە یەکەوە دەرکەون. وەك

- هەر تەنیا ئەو دوو منداڵە هاتوون.
- ئەو هەموو کتێبانەت کڕیوە؟

**٢- دیارخەری دوای سەرە (بە هۆی ئامرازەوە):**

ئەم جۆرە گرێیە بڵاوترین جۆری گرێی ناوییە لە زمانی کوردیدا، کە لە سەرەو دیارخەرێك، یان چەند دیارخەرێك پێکدێت، دیارخەرەکان دوای سەرە دەکەون بە هۆی ئامرازی خستنە سەری {ی، ە} ەوە. ئەو دیارخەرانەی دوای سەرە دەکەون لە گرێی ناویدا بریتین لە مانەی خوارەوە:

ناو ــــــ کچەکەی دارا سووتاوە.
ئاوەڵناو ــــــ قوتابی زیرەك خۆشەویستە.
چاوگ ــــــ هۆڵی خوێندنیان پاکە.
جێناو ــــــ دارەکەی ئێمە وشك بووە.
لاڕستە ــــــ ئەو کوڕەی کە لێرە دانیشتووە برامە.

ئەگەر گرێی ناوییەکە ناسراو کرابوو، ئەوا ئامرازی خستنەسەری(ی) دەگۆڕێ بۆ(ە) مۆرفیمی ناسراوەکەش دەچێتە سەر دوا دیارخەر. وەك لەم نموونانە دەردەکەوێ:

- قوتابی زیرەك خۆشەویستە.
- قوتابیە زیرەکەکە خۆشەویستە.
- قوتابیە جوانە ژیرە هەژارە زیرەکەکە خۆشەویستە.

بەلام ئەگەر گرێی ناوییەکە دۆخی خاوەنێتی بوو، وەسفی نەبوو، ئەوا مۆرفیمی ناسراوەکە هەر لەسەر ناوەکە (سەرەکە)دەمێنێتەوە ناچێتە سەر دیاخەرەکە، ئامرازی خستنە سەرەکەش ناگۆڕێ. وەك ئەم نموونانە:

- خانووەکەی ئازاد فرۆشرا.
- کوڕەکەی تۆ زیرەکە.
- دار گوێزەکەی ئێوە بەناوبانگە.

گرێی ناوی دەتوانرێ فراوان بکرێ بە لێکدانی هەردوو جۆرە دیارخەرەکان (دیارخەری پێش سەرەو دوای سەرە) وەك:

- ئەم دوو قوتابییە زیرەکانەی ئێوە
- ئەوهەموو گوڵە جوانانەی تۆ

٢- گرێی ناوی لێکدراو: ئەم جۆرە گرێیە دەگرێتەوە کە لە دوو گرێی سادە، یان زیاتر پێکدێت بە پێی پێویست. هەریەك لە گرێ سادەکان گرێی سەربەخۆن لە روی فۆرم و واتاوە کە بە هۆی مۆرفیمی (و) و(لەگەڵ) لێك دەدرێن[1].

- مۆرفیمی (و)

ا- لێکدانی دوو گرێی ناوی سادەی ناوك، یان زیاتر بەیارمەتی مۆرفیمی(و) وەك:

- ئازاد و نەوزاد بران.

گ ن١ گ ن٢

گ ن لێکدراو

[1]- د. ساجیدە عەبدوڵلا و د.تالیب حوسێن عەلی، ٢٠٠٦، ل٧٣٩ .

– دایك و باوك و خوشك و براكانم ئامادەبوون.

گ ن١ گ ن٢ گ ن٣ گ ن٤

گ ن لێكدراو

ب– لێكدانی دوو گرێی ناوی سادەی فراوانكراو وەك:

– ئەم گفتوگۆ تاڵ و ئەم دیمەنە سەیرانە....دەنگو باسێكی بێ كۆتاییان بۆ شی كردمەوە،

گ ن١ گ ن٢

گ ن لێكدراو

– ئەو هەموو هەستە ناسك و ئەم سۆزە گەرمانە وایان لێكردم هەوڵبدەم.

گ ن١ گ ن٢

گ ن لێكدراو

– مۆرفیمی (لەگەڵ)

أ– لێكدانی دوو گرێی ناوی سادەی ناوك، یان زیاتر بەیارمەتی مۆرفیمی (لەگەڵ)[١] وەك:

– بارام لەگەڵ دارا چوون بۆ بازار.

گ ن لێكدراو

– من لەگەڵ تۆ دەخوێنم.

گ ن لێكدراو

---

[١] – ئاواز حەمە سدیق، ١٩٩٦، ل٢٦ .

ب- لێکدانی دوو گرێی ناوی سادەی فراوانکراو، یان زیاتر.

- ژانی هەردوو پێیەکانی لەگەڵ ئازاری بڕبڕەی پشتی مێشکیان دەتەزاند.

گ ن لێکدراو

- فرمێسکی شاراوەی چاوەکانم لەگەڵ وشە خنکاوەکانی گەرووم کردە زەردەخەنە و.....

گ ن لێکدراو

بە لێکدانی هەردوو جۆرە گرێیەکە، واتە بەکارهێنانی مۆرفیمی (و، لەگەڵ) لە یەك گرێدا گرێی ناوی لێکدراو دروست دەکەن . وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- ئافرەتەکە لەگەڵ پیرێ ژنێك و لاوێکی هەرزەکاردا هاتوونەتە بەر دەرگاکەوە.

گ ن لێکدراو

- نەسرین و پەروین لەگەڵ دایکیان لە هەندەران دەژین.

گ ن لێکدراو

٣- گرێی ناوی ئاڵۆز:

ئەو جۆرە گرێیە دەگرێتەوە کە زیاتر لە لێکدانەوە و بۆ چونێکی هەیە، واتە تەم و مژییەك لە نێوان کەرەسەکانی گرێیەکە و ڕۆنانەکەی پەیدادەبێ کە وای لێ دەکات دوو جۆر لێکدانەوە، یان زیاتر بۆ گرێیەکە بێتە ئاراوە، بە شێوەیەکی گشتی هەردوو ئامرازی (و، ی) پێکەوە بەشداری لە دروستکردنی ئەم جۆرە گرێیەدا دەکەن. بۆ نموونە بۆ هەر یەکێك لەم ڕستانەی خوارەوە دوو جۆر گرێ دەتوانرێت جیا بکرێتەوە:

- پیاو و ژنی گەنج و پیریان بانگ کردبوو.
- (پیاو و ژنی )گەنج و پیریان بانگ کردبوو.
- پیاو و( ژنی گەنج و پیر)یان بانگ کردبوو.

- ئاواز و ئارازی خوشکم هاتن.
- (ئاواز و ئارازی) خوشکم هاتن.
- ئاواز و( ئارازی) خوشکم هاتن.

- داراو کاوه و پەروینی پارێزەر لێرەن.
- (داراو کاوه و پەروینی) پارێزەر لێرەن.
- داراو کاوه و( پەروینی) پارێزەر لێرەن.

دیارخەری هەریەك لەم گرێیانەی سەرەوه (گەنج و پیر، خوشك، پارێزەر) دوو لێکدانەوه هەڵدەگرن، جارێکیان بۆ هەموو ناوەکان دەگەڕێنەوه و جارێکی تریشیان تەنیا بۆ ناوی دوایی دەگەڕێنەوه.

دووەم/ گرێی کاری:

به پێکهێنەرێکی سەرەکی ڕسته دادەنرێت،چونکه لەناو ڕستەدا به خورتییەو ناتوانرێت لاببرێت. گرێی کاری لەسادەترین ڕۆناندا لە کاریٚ پێکدێت کە لە ڕووی ڕۆنانەوه ناسادەیه و تێیدا مۆرفیمی ڕەگی کار مۆرفیمێکی تەوەرەییەو مۆرفیمە بەندەکانی تری وەك مۆرفیمی کات و جێناوی لکاوی بۆ دەگەڕێتەوه[1] .کە هەر یەکەیان ریزبوونێکی دیاریکراوی تایبەت بە خۆیان هەیە. واته بەلای کەمەوه گرێی کاری سادەی ناوك دەبیٚ لەم بەشانەی خوارەوه پێك بێت:

{ڕەگ[2] + م.کات + جێناوی لکاو (کەس و ژمارە)}.

---

[1]- تالیب حوسێن و دیار عەلی کەمال، کۆفاری زانکۆ، ژ۲۱، ل۲۵۰ .

[2]- ڕەگی کار سیٚ جۆرە :

۱- ڕەگی سادە وەك : (چوو، کرد، خوێند، .....).

۲- ڕەگی دارێژراو وەك:( ڕامالی، هەلگرت، داخست، ...).

۳- ڕەگی لێکدراو. وەك: ( دروستکرد، بەلێنی دا، سوێندی خوارد، خۆشی ویست،....).

**کاری تێپەڕ**

ڕابردوو ——— دەم خوێند

دە + م+ خــوێن+ د+ Ø {م.بــەردەوامی+جێناوی لکاو(بکــەر)+ڕەگ+ م.کات+ جێناوی لکاو(بەرکار)}

ڕانەبردوو——— دەخوێنم

دە + Ø +خــوێن+Ø +م{م.بــەردەوامی+جێناوی لکاو(بــەرکار)+ڕەگ+ م.کات+ جێناوی لکاو(بکەر)}

**کاری تێنەپەڕ**

ڕابردوو——— دەچووم

دە+ چ+وو+م {م.بەردەوامی+ ڕەگ+ م.کات+جێناوی لکاو(بکەر)}

ڕانەبردوو——— دەچم

دە+ چ+ Ø+م {م.بەردەوامی+ ڕەگ+ م.کات+جێناوی لکاو(بکەر)}

گرێی کاری فراوانکراو: گرێی کاری لە رووی تیۆرییەوە دەکرێت تابێ کۆتا درێژبکرێتەوەو فراوانبکرێت. ئەمەش بە ڕێگای زیادکردنی(ئاوەڵکار، گرێی بەند، دیارخەر، گرێی ئاوەڵناوی و....) دەکرێ و ببنە بە شێك لە گرێی کاری . زیادکردنی ئەو کەرەسانەش لە سنووری ڕستەدا بۆ ئەو مەبەستەیە کە قسەکەر دەیەوێت روونکردنەوەی زیاتر لەبارەی ڕستەکە دەرببڕێت، بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر بە گوێگر ڕابگەیەنێت. ئەمانەی خوارەوە هەندێ لەو نموونانەن:

- ئێستا دەڕۆین.
- براکەم نامەکەی خێرا نووسی.
- منداڵەکە هێشتا نووستووە.
- پیاوەکە زۆر بە جوانی کاردەکات.
- کاوە کتێبەکەی لەسەر مێزەکە دانا.

**سێیەم/ گرێی ئاوەڵناوی:**

ئەو جۆرە گرێیە سەرەکەی دەبێ ئاوەڵناو بێت، واتە بە بێ بوونی ئاوەڵناو گرێی ئاوەڵناوی دروست نابێت. ئەم جۆرە گرێیە بە پێچەوانەی گرێی ناوی لە رووی رۆنانەوە سادەیە و وەکو گرێی ناوی گەورەو فراوان ناکرێت، بەلآم هەندێ جار بە ڕادەیەکی زۆر کەم فراوان دەکرێت، ئەویش بە یارمەتی هەندێك ڕادە(چەندێتی) کە دەکەونە پێش ئاوەڵناوەکە وەك {زۆر، یەکجار، هەندێك، کەمێك.....هتد}[1]. وەك ئەم نموونانە:

- پیاوەکە کەمێك شارەزایە.
- منالێکی زۆر ئازاو وریایە.
- خانووەکەیان یەکجار کۆنە.

**چوارەم/ گرێی بەند:**

ئەو گرێیەیە کە بە یارمەتی یەکێك لە ئامرازەکانی پەیوەندی{لە، بە، بۆ} دروست دەبێت، واتە کاتێ ئەم ئامرازانە دەچنە سەر ناوێك، یان گرێیەکی ناوی گرێیەکی بەند پێکدێنن. لەم جۆرە گرێیەدا ئامرازەکان دەبنە سەرەو کەرەسەکانی تر دەبنە دیارخەر، واتە ئامرازە پەیوەندییەکە بڕیار دەدات کە چ جۆرە دیارخەرێك لە رۆنانەکەدا هەبێت، چونکە رۆنانەکە هەمووی باس لە جۆرێك لە شوێن، یان لە کات، یان هۆکار، یان ئامێر، یان مەبەست......هتد دەکات، بۆ نموونە (لە دەرەوە) دەگەڕێتەوە بۆ شوێن نەك بۆ جۆرێك لە (دەرەوە). هەروەها (لەناو ئێوە) بۆ هۆ نەك بۆ جۆرێك لە (ئێوە) دەگەڕێتەوە. ئەمانەی خوارەوەش هەندێ لەو نموونانەن:

- پیاوەکە بە کوڕەکەی دەخوێنێ.
- کتێبەکەم بۆکتێبخانە بردەوە.
- ژنەکە خوێی لە چێشتەکە کرد.
- پارەکەی لە گیرفانی دانا.

---

[1]- ئاواز حەمە سدیق، ١٩٩٦، ل٤٠ .

- هەواڵەکەی بە ئێمە گەیاند.
- دارەکەی لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنا.

**پێنجەم/ گرێی ئاوەڵکاری:**

ئەو جۆرە گرێیە سەرەکەی دەبێ ئاوەڵکار بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ئاوەڵکارانەی بەئامادەکراوی هەن لە ناو فەرهەنگی زمانەکەدا وەك (هەمیشە، هەرگیز، هێشتا، دیسان، خۆزگە، ڕەنگە، لێرە........) ژمارەیان زۆر کەمەو بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، سوود لە جۆرەکانی تری گرێ وەردەگیرێ وەك (گرێی ناوی و گرێی ئاوەڵناوی و گرێی بەند،....) کە لە ناو ڕستەدا ئەرکی ئاوەڵگوزارە دەبینن[1]، کە لەم نموونانەی خوارەوە روون دەبێتەوە:

- منداڵەکە هێشتا نووستووە. گرێی ئاوەڵکاریە
- مرۆڤ هەرگیز مردنی بیر نییە. گرێی ئاوەڵکاریە
- قوتابییەکان دوێنێ بەیانی چوون بۆ سەیران . گرێی ناویە(ئەرکی ئاوەڵگوزارەیە)
- براکەم ئەم بەیانییە نە هاتووە بۆ زانکۆ. گرێی ناویە(ئەرکی ئاوەڵگوزارەیە)
- قەڵەمەکەم زۆر جوان دەنووسێ. گرێی ئاوەڵناویە (ئەرکی ئاوەڵگوزارەیە)
- هاوڕێکانم زۆر باش دەخوێنن. گرێی ئاوەڵناویە (ئەرکی ئاوەڵگوزارەیە)
- شوانەکە لە ژێر دارەکە نووستووە. گرێی بەندە (ئەرکی ئاوەڵگوزارەیە)
- ئەوان بە ڕاکردن هاتن. گرێی بەندە (ئەرکی ئاوەڵگوزارەیە)

**ڕستە و کەرەستەکانی ڕستە**

ڕستە گەورەترین یەکەی سینتاکسییە کە لە ڕۆنانی ژێرەوەی دا کەرەسە پێکهێنەکانی (گرێی ناوی و گرێی کاری) بەهۆی یاسا

---

[1]- بروانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە: ا- ئاواز حەمە سدیق، ١٩٩٦، ل٣١. ب- محەمەد عومەر عەول، ٢٠٠٨، ل٢٠.

سینتاکسییەکانەوە بەیەکترەوە بەندن[1]. یان ڕستە لە کۆمەڵێك کەرەسەی دیاریکراو پێکدێت کە بە گوێرەی چەند یاسایەك داڕێژراون، ئەو کەرەسە دیاریکراوانە، هەندێکیان سەرەکین و هەندێکیان ناسەرەکین، کەرەسە سەرەکییەکان بە خورتییەو دەبێ لە ڕستەدا هەبن و ناتوانین لایان ببەین، بەڵام کەرەسە ناسەرەکییەکان بە ئارەزووە دەتوانین لایان ببەین[2].کەرەسەکان لە ناو ڕستەدا بە شێوەی گرێ دەردەکەون، ئەم گرێیانەش چەند ئەرکێکی ڕێزمانی دەبینن ئەرکەکانیش بریتین لە {بکەر، بەرکار، ئاوەڵگوزارە، سەربار، تەواوکاری کار....}.

## بکەر Subject

(بکەر)، کەرەسەیەکی سەرەکی ڕستەیە، بریتییە لە یەکەم گرێی ناوی و لە ژێر دەسەڵاتی ڕستەیەو بە شێوەیەکی گشتی لە زمانی کوردیدا دەکەوێتە سەرەتای ڕستە، (کار) باسێکی لە بارەوە ڕادەگەیەنێت[3]. بە واتایەکی تر بکەر ئەو کەرەسەیە کە لەکەس و ژمارەدا لەگەڵ کاری ڕستە ڕێك دەکەوێت. وەك ئەم نموونانە:

- مندااڵەکە نووست .
  بکەر کار
- ئەوان هاتن < ڕێککەوتن لە کەس و ژمارە

گرێی ناوی بە هەموو جۆرەکانیەوە ئەم ئەرکە دەبینێ لە ڕستەدا لەم نموونانە دەردەکەون:

گرێی ناوی سادەی ناوك:

---

1- Trask ,R.L, 1993 , P250

2- خەسرۆ ئەحمەد خۆشناو، ٢٠٠٨، ل٣٥

3- ئەحمەد حەسەن فەتحوڵڵا، ١٩٩٠، ل٥ .

- دارا ڕۆیشت.
- من دەنووسم.
- ترس هێرشی بۆ دەهێنام.
- کرێکار بە گەرمی خەریکی پاك کردنەوەی بوون.

گرێی ناوی سادەی فراوانکراو

- ئەو دوو قوتابیە زیرەکە زۆرباش دەخوێنن .
- سێ پیاوی چەکدار بەغار هاتنە خوارێ.
- کرێکارێکی لاوازی درێژی جل شڕ هەڵی دانێ.
- لە شکری دڕندەی دوژمن هێرشی هێنایە سەر وڵات.

گرێی ناوی لێکدراو

- چیمەن و باوکی تاریك و ڕون بەڕێ دەکەون.
- سارا لەگەڵ شیراز و برا بچووکەکەی چووبوونە پارکی شانەدەر.

## بەرکار Object

(بەرکار)،ئەو کەرەسەیە لەناو ڕستەدا کە لەژێر کاریگەری کردەی کاردایە، ئەگەر ئەو کەرەسەیە ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری کاردابێت، ئەوا پێی دەوترێ بەرکاری ڕاستەوخۆ. بەرکاری ڕاستەخۆ ئەو گرێ ناوییەیە کە لە ژێر کاری ڕستەدایەو فراوانی دەکات و وەلامی پرسیارێك دەداتەوە کە بە (کێ، یان چی) بکرێ[1] . بە واتایەکی تر بەرکاری ڕاستەوخۆ خۆی لە دووەم گرێی ناوی ڕستەدا دەنوێنێ لە ژێر گرێی کاری ڕستەدایەو کەرەسەیەکی سەرەکی ئەو ڕستانەیە کە کارەکانیان تێپەڕە. ئەو کەرەسانەی ئەم ئەرکە دەبینن بە شێوەیەکی گشتی لە زمانی کوردیدا گرێی ناوییە بە هەموو جۆرەکانییەوە وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

گرێی ناوی سادەی ناوك:

---

[1] – خەسرۆ ئەحمەد خۆشناو، ٢٠٠٨، ل٣٨

- جووتیارەکە زەوی دەکێڵێ.
- براکەم نامەی نووسی.
- گۆڤارەکانیان سووتاند.
- لافاوەکە خانووەکانی رووخاند.

گرێی ناوی سادەی فراوانکراو:

- قوتابخانەکان هەموو قوتابیە زیرەکەکانیان خەڵات کرد.
- دوو ڕۆژنامەی زەردی قەراغ دراوی لە پاکەتەکە هێنانە دەرێ.
- مامۆستاکە کتێبێکی گەورەی قەبارە ئەستوری لە سەر مێزەکە دانا.

گرێی ناوی لێکدراو

- قەلەم و قەلەمدان و لاستیکی خەت کوژانەوەکەش لەو لاوە دایان دەنێم.
- دایك و باوك ومنداڵەکانیان کوشت.
- هەوری چڕ تریفەی مانگ و جریوەی ئەستێرەکانی دا دەپۆشی.

بەرکاری ناڕاستەوخۆ

ئەو کەرەسەیە لەناو ڕستەدا کە بە شێوەی گرێیەکی بەند دەردەکەوێت و ناڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کارەکە و فراوانی دەکات و وەڵامی پرسیارێك دەداتەوە کە بە {کێ،یان چی} بکرێ وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- مامۆستاکە کتێبەکانی دا بە قوتابیەکان.
- براکەم نامەکە بۆ ئەوان دەبات.
- پەروین جوانی بە ئاوات ناساند.
- ئەو جێگەی بۆ ئازاد کردەوە.

## ئاوەڵگوزارە: Adverbial

(ئاوەڵگوزارە) کەرەسەیەکی ناسەرەکی ڕستەیە، چونکە لابردنی نابێتە هۆی دروست بوونی ڕستەی نارێزمانی و بە شێکە لە گرێی کاری ڕستەو فراوانی دەکات و ڕوویەکی کاری ڕستە ڕوون دەکاتەوە. بە شێوەیەکی گشتی گرێی بەند ئەم ئەرکە دەبینێ لە ناو ڕستەی کوردیدا، بەڵام هەندێ جاریش گرێی ناوی و گرێی ئاوەڵناویش ئەم ئەرکە دەبینن. ئاوەڵگوزارە لە رووی ناوەرۆکەوە دەبێتە چەند جۆرێك لە وانە (کات، شوێن، چۆنیەتی، هۆ، پێوانە....هتد)[1]. شوێنی ئاوەڵگوزارە کەرەسەیەکی بزێوە و دەشێ لە ناو ڕستەدا لە ریزبوونیاندا ئازادانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێ و شیاو بێت لە هەر جێکەوتەیەکی ڕستەکەدا بێت[2]. واتە (قسەکەر زۆرجار بە پێی مەبەستی خۆی یان بە پێی بنەمای هاریکاری شوێنی ئاوەڵگوزارەکان دەگۆرێت)[3]. لەم نموونانەی خوارەوەدا هەریەك لەم جۆرانە ڕوون دەکەینەوە:

گرێی بەند (ئەرکی ئاوەڵگوزارەی شوێن دەبینێ)

- ئەوان لە ماڵەوە دەخوێنن.
- باوکم لەدهۆك دەژی.
- گرانی وبرسیەتی لە وولات ڕەگی داکوتا.

گرێی بەند (ئەرکی ئاوەڵگوزارەی کات)

- خەڵکەکە لە بەیانییەوە چاوەروانن.
- بە شەو دەچینە میوانی.
- لە زەمانی زوودا میللەتێك لە ڕۆخی دەریای ڕەشدا دەژیان.

---

[1]- شلێر رسوول محەمەد، ١٩٩٠، ل٤١.
[2]- کاروان عومەر قادر، ٢٠٠٦، ل٥٥.
[3]- ئاواز حەمە سدیق، ١٩٩٦، ل٦٦.

گرێی بەند (ئەرکی ئاوەڵگوزارەی هۆ)

- من لە خۆشیان هیچم پێ نەگوت.
- ئەو لە ترسان دەلەرزی.
- خەڵك لە ترسی فڕۆکە هەر بەشەو لە دێیەکەوە دەچێت بۆ دێیەکی تر.

گرێی بەند (ئەرکی ئاوەڵگوزارەی چۆنیەتی)

- قوتابیەکان بە باشی دەخوێنن.
- بەخێرایی تێپەڕی.
- لەشکرەکەی دوژمن بە سەر شۆڕی و بەزیوی لە گوند کشایەوە.

گرێی ناوی ( ئەرکی ئاوەڵگوزارەی کات)

- دوێنێ شەو میوانەکان گەیشتن.
- بەیانی پشووی هاوین تەواو دەبێت.
- ئەو کاتە تاریکایی باڵی ڕەشی بەسەر ئەو خێزانە بەدبەختە داگرتبوو.

گرێی ئاوەڵناوی (ئەرکی ئاوەڵگوزارەی چۆنیەتی)

- قەڵەمەکەم زۆر جوان دەنووسێ.
- منداڵەکە زۆرباش دەڕوات.
- پرسیار تیرێکە کوێرانە دەهاوێژرێ.
-

لەم پۆلینەدا هێڵێکی ڕێزمانی ئاشکراو روون بەرکاری ناڕاستەخۆ لە ئاوەڵگوزارە جیاناکاتەوە، زۆربەی ئەزموونە ڕێزمانییەکان ئەوە دەسەلمێنن

که ئەم دووانە لە هەڵکەوت و پێکهاتن و ڕەفتاردا هەر یەك شتن و جیانابنەوە وەك ئەم خاڵانەی خوارەوە دەری دەخات[1]:

١-هیچ جیاوازییەك لە ڕۆناندا لە نێوان بەرکاری ناڕاستەوخۆ و ئاوەڵگوزارە بە دی ناکرێ، هەردووکیان بە شێوەی گرێی بەند دێن وەك:

- کتێبەکەی بەمن دا نارد. (بەرکاری ناڕاستەخۆ)
- منداڵەکە بە دیوارەکەدا هەڵدەگەڕا. (ئاوەڵگوزارە)

٢-لە هەردووکیاندا گرێیە ناوییەکە دەتوانێ ناوی بێ گیان، یان گیاندار بێت:

- ئەو نەخۆشییەکەی لە منەوە گرت. (بەرکاری ناڕاستەخۆ)
- ئەو لە منەوە دەست پێ دەکات. (ئاوەڵگوزارە)
- لە دەرگای دا. (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)
- لە دەرگاکەوە هاتە ژوورێ. (ئاوەڵگوزارە)

٣- هەردووکیان لەگەڵ کاری تێپەڕ و تێنەپەڕدا دێن:

- لەمن دەترسێ. (ئاوەڵگوزارە)
- لە من دەدات. (بەرکاری ناراستەوخۆ)
- ئەو بە من ناگات. (ئاوەڵگوزارە)
- ئەو بە من دەڵێ. (بەرکاری ناراستەوخۆ)

٤- هەردووکیان بە هۆی گرێ و پارستەی ئاوەڵناوییەوە فراوان دەکرێن:

- کتێبەکەی بە پیاوە قەڵەوەکەدا نارد. (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)
- منداڵەکە بە دیوارە بەرزەکەدا هەڵگەڕا. (ئاوەڵگوزارە)

---

[1]- محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٢، ل١٠.

٥- هەردووکیان بە ڕاناو لە ڕستەدا جێگیر دەکرێن:

- کتێبەکەی دا بەمن . (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)

-کتێبەکەی دا پێم.

- بەو ڕێگایەدا مەڕۆ. (ئاوەڵگوزارە)

- پێدا مەڕۆ.

٦- هەردووکیان جێگۆڕکێ دەکەن بە تایبەتی کە بکەری ئاشکرا لە ڕستەکەدا نەبێ:

- کتێبەکەی دا بەمن . (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)

- بە منی دا کتێبەکە.

- بەم ڕێگایەدا مەڕۆ. (ئاوەڵگوزارە)

- مەڕۆ بەم ڕێگایەدا.

٧- بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەوەدا(بەرکار) نییە کە بەرز ناکرێتەوە بۆ بکەر لە ڕستەی بکەرنادیاردا:

- جلەکانی بەمندا نارد. (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)

- جلەکان بە مندا نێردران.

- لە دەرگاکەی دا. (ئاوەڵگوزارە)

- لە دەرگاکە درا.

- دەرگاکە درا.

٨- هەردووکیان توانای وەرگرتنی نووسەکیان تێدایە:

- زۆرم خوارد. (ئاوەڵگوزارە)

- پێم گوت. (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)

## سەربار Adjunct

(سەربار) بەو کەرەسەیەی ڕستە دەگوترێت، کە دەکرێ لە ڕستەدا لاببرێت بێ ئەوەی دروستەو کرۆکی ڕستەکە بشێوێنێت[1]. واتە سەربار تەنیا بارو مەرجی ڕووداوەکە، یان بارەکەی دەردەخات و لە ڕووی واتاوە گرنگی نییە، چونکە واتای ڕستەکە بە بێ ئەمیش هەر تەواوە[2].

سەربار دەشێت بە هۆی گرێی (ناوی، ئاوەڵناوی، بەرناو، ئاوەڵکار...)یەوە بنوێنرێت، لەناو ڕستەشدا پێش بکەر بکەوێت، یان پێش بەرکار و کار بکەوێت، یان لە نێوان بەرکار وکاردا دێت. ئەمانەش هەندێ نموونەن بۆ سەربار:

- دارا لەو دوکانە کتێب دەکڕێ.
- ئێوە زەوی بە مەکینە دەکێڵن.
- ئەو لەمن دەترسێ.
- زۆرم خوارد.
- هەندێ کەس لە ژێر لێداندا دەمرن.

## تەواوکار Complement

(تەواوکار) بەو کەرەسانە دەگوترێن کە لە ڕستەدا دەبنە پێویستییەکی هەمیشەیی کارەکەو ناتوانرێ وازیان لێ بهێنرێ، واتە لابردنی بە خورتییە، یان دەبێتە هۆی نارێزمانی بوونی ڕستەکە، یان ناوەڕۆکی واتای کارو ڕستەکە دەگۆڕێت، چونکە (یەکێك لە تایبەتییە هەرە گرنگەکانی تەواوکار ئەوەیە کە کەرەستەیەکی پێویستە لە ڕستەدا، بەواتای ئەوەی لە پلەی کارو بکەردایەو لانابرێت بێ ئەوەی واتاو دروستەی ڕستەکە تێکنەدات)[3]. چونکە تەواوکار و کارەکە توندتر چوونەتە ناو دروستەی

---

[1] – مەحموود فەتحوڵلا ئەحمەد، ١٩٨٨، ل١٣ .

[2] – ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، ١٩٩٥، ل٦٥.

[3] – مەحموود فەتحوڵلا ئەحمەد، ١٩٨٨، ل١٢.

ڕستەکەوە و دروستەی ناوەکییان پێکهێناوە[1]. گرێکان بە هەموو جۆریانەوە {گرێی ناوی ، گرێی ئاوەڵناوی، گرێی بەند.....} ئەم ئەرکە دەبینن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە زمانی کوردیدا گرێی ئاوەڵناوی ئەم ئەرکە دەبینێ، وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

- گوارەکەی نەسرین زێڕە.
- باخچەکانیش وێران کران و بوون بە شۆستە و شەقام.
- برای ئازاد پۆلیسە
- ئەم هەنارە زۆر ترشە.
- کورەکەی بوو بە مامۆستا.
- منداڵەکە دوێنێ لە دایك بوو.
- مارەکە بە پیاوەکەی وەدا.
- کورەکە زەرد هەڵگەڕا.

**جیاکردنەوەی تەواوکارو سەربار**

بە چەند خاڵێك تەواوکار و سەربار لە یەکتر جیادەکرێتەوە لەوانە:

١- تەواوکار بەندی کارەو هاوبەشی دەکات لەو بارە، یان ڕووداوەی کە کارەکە ڕای دەگەیەنێ و بە شێکی گرنگە کە لە واتای کارەکە جیانابێتەوە، کەچی سەربار تەنیا بارو مەرجی ڕووداوەکە، یان بارەکەی دەردەخات و لە ڕووی واتاوە گرنگی نییە.

- ئەو لە ژوورەکە دانیشت.

سەربارە

- براکەم لە دەرەوەی کوردستان دەژی.

سەربار

- ئەو لە ژوورەوەبوو.

تەواوکار

---

[1]- محەمەد عومەر عەول، ٢٠٠٨، ل٢٨.

- براکەم لە دەرەوەی کوردستانە.
تەواوکار

٢- لادان، یان فڕێدان بە تاقیکردنەوەیەکی سینتاکسی دادەنرێ بۆ جیاکردنەوەی تەواوکارو سەربار. تەواوکار بە ئارەزوو فڕێ نادرێ لە ڕستەدا، چونکە بەندە بەکارەوە و کارەکە وازی لێ ناهێنێ، بەڵام سەربار بە پێچەوانەوە بە ئارەزوو بەئاسانی فڕێ دەدرێ بێ ئەوەی کاربکاتە سەر ڕستەکە لە رووی واتاوە[1].

- دارا کەل و پەلەکانی خستە ناو تورەگەیەکەوە. تەواوکارە
- دارا کەل و پەلەکانی لە ناوتورەگەیەك هەڵگرتووە. سەربارە

٣- ژمارەی تەواوکار سنووردارە بە پێی جۆری ئەو کارەی داوای تەواوکار دەکات، بەڵام ئەم سنوورداریيە بۆ سەربار نییە، چونکە هیچ سنورێکی ڕێزمانی بۆ ژمارەی سەربار لە دروستەی ڕستەدا نییە[2].

- پیاوەکە لە منداڵەکەی دا. تەواوکار
- ژنەکە خوێی لە چێشتەکە کرد. تەواوکار
- دوێنێ بەیانی دایکەکە بە پەلە منداڵەکەی لە بێشکەدا نواند.
سەربار١ سەربار٢ سەربار٣

کار Verb

(کار) لە زمانی کوردیدا ئەو کەرەسەیەیە لە ڕستەدا کە دەکەوێتە کۆتایی ڕستەو باسێك لەبارەی بکەرەوە ڕادەگەیەنێت، ئەم کەرەسەیەی ئەو ئەرکە دەبینێ گرێی کارییە. کار بەشێکی سەرەکی ڕستەیەو دەورێکی

[1] - ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، ١٩٩٥، ل٦٥.
[2] - محەمەد عومەر عەول، ٢٠٠٨، ل٢٨.

گرنگی هەیە لە دروستکردنی ڕستە لە زماندا و هیچ ڕستەیەکیش بێ کار دروست نابێ و هەموو کەرەسەیەکی تری ڕستە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەخۆ پەیوەندیان بەکارەوە هەیە. هەروەها هەموو کارێك بە پێی توانا و سروشتی خۆی پێویستی بە چەند کەرەسەیەك هەیە. کار هەیە تەنیا پێویستی بەیەك کەرەسە هەیە، هەندێکی تر چەند کەرەسەیەك. بە پێی پەیوەندی نێوان چوارچێوەی کارو ئەو کەرەسانەی وەری دەگرێت چەند جۆرێك لە

کار پۆلین دەکرێن لە وانە:

أ-ئەم کۆمەڵە بریتییە لەو کارانەی کە تەنیا یەك کەرەسە( یەك گرێی ناوی) وەردەگرن و پێویستیان بەکەرەسەی تر نییە بەم کارانە دەوترێ تێنەپەڕ لە بەر ئەوەی تەنیا بکەر وەردەگرن وەك کاری ئەم ڕستانەی خوارەوە:

- قوتابییەکان ڕۆیشتن.
- ژنەکە قیژاندی.
- کۆترەکە فڕی.

ب- ئەم کۆمەڵەیە بریتییە لەو کارانەی کە دوو کەرەسە(دووگرێی ناوی) وەردەگرن ، واتە تەنیا بە کەرەسەیەك واتای ڕستەکە تەواو نابێت، بۆیە پێویستی بە کەرەسەیەکی تریش هەیە بۆ ئەوەی واتای ڕستەکە تەواو بکات بەم جۆرەیان دەوترێت تێپەڕ، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- باوکم خانووەکەی فرۆشت.
- پۆلیسەکە دزەکەی گرت.
- منداڵەکە نانەکەی خوارد.

ج- ئەم کۆمەڵەیە بریتییە لەو کارانەی کە دوو کەرەسە(گرێیەکی ناوی و گرێیەکی بەند)وەردەگرن ناکرێ ئەم دوو کەرەسەیە هیچیان لادرێ[1] وەك ئەم رستانە دەری دەخەن:

---

[1]- پ. د.محەمەد مەعرووف فەتاح، نوسەری نوێ، ژ ١٩، ساڵی ٢٠٠١، ل١٧٤.

- داوەکە لە قاچم ئالاّ.
- پیاوەکە لە دەرگای دا.
- ئەوان لە ئێمە ناگەن.
- مارەکە بە کوڕەکەی وەدا.

د - ئەم کۆمەڵە بریتییە لەوکارانەی کە سێ کەرەسە (دوو گرێی ناوی و گرێیەکی بەند)وەردەگرن، واتە تەنیا بە دوو کەرەسە ڕستەکە واتاکەی تەواو نابێت بۆیە پێویستی بە کەرەسەی تر هەیە بۆ ئەوەی واتاکەی تەواو بێت، دەتوانین بەم جۆرەیان بڵێین تێپەڕی ئاوێتە[1] وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- من تۆ بە برا دەزانم.
- کچەکە بەردی لە پشیلەکە گرت.
- ژنەکە خوێی لە چێشتەکە کرد.
- منداڵەکە دەست لە کتێبەکان دەدات.
- ئەو کتێبەکەی بەمن دا.

## ریزبوونی کەرەسەکانی ڕستە

هەر زمانێك ڕێگایەکی هەیە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی کەرەسە نیشان بدات، لە هەندێ زماندا بۆ ئەوەی پەیوەندی سینتاکسی نیشان بدات، پشتی بە کەرەسە ریزبوون بە ستووە ، واتە ریزبوونی کەرەسەکان لە ناو چوارچێوەی ڕستەدا وەك کەرەسەیەکی واتای رێزمانی تەماشادەکرێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. جۆری ریزبوونی کەرەسەکان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆرێت، ڕستەی هەموو زمانێك ئەم سێ بەشە سەرەکییەی هەیە:

---

[1]- زۆربەی رێزمان نوسەکان باسی ئەم جۆرەیان نەکردووە تەنیا تێپەڕ و تێنەپەریان لێك جیاکردۆتەوە .

{ Verb  کار  Object - بەرکار  Subject– } بکەر

هەر زمانێك بە پێی دەستوور و یاساکانی سینتاکسی ئەو زمانە هەر سێ بەشە سەرەکییەکەی ڕستەیەك لە دوای یەك ریزدەکات. لە زمانی کوردیدا ریزبوونی ئاسایی بە جۆری (بکەر + بەرکار + کار) دادەنرێت، چونکە زۆربەی ڕستەکانی کوردی ڕۆنانێکی ناوەوەیان هەیە کە بە (بکەر) دەست پێ دەکات و بە (کار)یش کۆتایی دێت. ئەم نموونانەی خوارەوە دەری دەخەن کە ریزبوونی ئاسایین:

–ئەم کرێکارە دیوارەکەی رووخاند. (تێپەڕ)

– بایەکە گەڵای دارەکەی وەراند.

– منداڵەکە نووست. (تێنەپەڕ)

– میوانەکان ڕۆیشتن.

ئەگەرچی هەندێ جار لە قسەکردندا ئەو ریزبوونە دەگۆڕێت، بە تایبەتی لە ڕستەی کورتکراوە و بە لووتکە کردنی بەرکاردا، یان بەکارهێنانی شێوازی جیاواز لە قسەکردندا. بەم ریزبوونەش دەوترێ ریزبوونی نائاسایی وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

– نانەکە دارا خواردی. (بەرکار+ بکەر+کار)

– منداڵەکە دایکەکە نواندی.

– کتێبەکە من کڕیم.

– گەڵای دارەکە بایەکە وەراندی.

بەڵام کەرەسە ناسەرەکییەکان شوێنیان چەسپاو نییە لە ڕستەدا بە ئارەزووە، واتە دەتوانن جێگۆڕکێ بکەن بە پێی مەبەستی قسەکەر، لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەوێ:

–دوێنی شەو میوانەکان گەیشتن.

– میوانەکان دوێنێ شەو گەیشتن.

– میوانەکان گەیشتن دوێنێ شەو.

**ڕستەی بە ڕاناو جێگیرکراو**

مەبەست لەم جۆرە ڕستەیە ئەوەیە کەبەشەکانی ناو ڕستە بەتایبەتی بەشە سەرەکییەکانی وەك بکەر و بەرکار بە ئاشکرا لە ناو ڕستەدا نایێت، بەڵکو ڕاناوە لکاوەکان ئەرکی بەشەکانی ناو ڕستە دەگێڕن و دەچنە سەر کارەکە . ڕاناوەلکاوەکان بە پێی جۆری کارەکە لە رووی کات و لەرووی هێزەوە( تێپەڕو تێنەپەڕ) شوێنی دەگۆڕێت بەم جۆرەی خوارەوە:

ا– کاری رابردوی تێپەڕو تێنەپەڕی سادەی بەردەوامی لە ڕێژەی ڕاگەیاندندا بەم جۆرە دەبێت:

دە + ڕەگ + م(کات) + ڕاناو( بکەر) **تێنەپەڕ (لە دۆخی ئەرێ دا)**

– دەچووم.

نە + دە + ڕەگ + م(کات) + ڕاناو( بکەر) **تێنەپەڕ (لە دۆخی نەرێ دا)**

– نەدەچووم.

دە + ڕاناو(بکەر) +ڕەگ + م(کات)+ڕاناو (بەرکار) **تێپەڕ (لە دوخی ئەرێ دا)**

– دەم زانی

نە + ڕاناو(بکەر)+دە+ڕەگ +م(کات)+ ڕاناو (بەرکار) **تێپەڕ (لە دوخی نەرێ دا)**

– نەم دەزانی

– کاری ڕانەبردوو لە دۆخی ئەرێ ونەرێدا:

دە + ڕاناو(بەرکار)+ ڕەگ + ڕاناو(بکەر) **تێپەڕ (لە دوخی ئەرێدا)**

– دەتانناسم

نا + ڕاناو(بەرکار)+ ڕەگ + ڕاناو(بکەر) **تێپەڕ (لە دوخی نەرێدا)**

– نایانناسم

ب– لەگواستنەوەی ڕستەی بکەردیار بۆ نادیار:

ئەگەر کاتی کارەکە لە ڕستەی بکەر دیار لە داهاتوودابوو ئەو ڕاناوەلکاوەی دەوری بەرکار دەبینێت لە کۆمەڵەی خاوەنێتیە{م–مان، ت–

تان،ی–یان} لەکاتی گواستنەوەی بۆ بکەرنادیاری ڕاناوەکە دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵەی ڕێککەوتن{م–ین،ی(یت)–ن،ێ(ێت)–ن} و جێی خۆی دەگۆڕێ و دەچێتە سەر ڕەگی کارەکە[1] بەم شێوەی خوارەوە:

– دەیان بینم

دە + ڕاناو(بەرکار)+ ڕەگ + ڕاناو(بکەر)

دە–یان– بین–م




ن     بین + ر + ێ



دە + ڕەگ +م ر+م(کات) ێ+ ڕاناو(بەرکار)

دەبینرێن

– دەتکوژن ← دەکوژرێی(یت)

**ڕستەی بکەر نادیار**

ڕستەی بکەر دیار بەو ڕستەیە دەگوترێ کە ئەو کەسەی کارەکە ئەنجام دەدات (بکەرەکە)لە شێوەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت، بە پێچەوانەوە ڕستەی بکەر نادیار بەو ڕستانە دەگوترێت کە تیایدا بە هەر هۆیەکەوە بێت بکەرەکە دیار نییە[2]، ئەو جۆرە ڕستەیەی کە دەکرێت بە بکەر نادیار دەبێت کارەکەی

---

[1]– وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٤، ل٢٧٥.

[2]– فەرەیدون عەبدول محەمەد، ١٩٨٨، ل٤٦.

تێپەر بێت ، چونکە کاری تێپەڕ پێویستی بە بەرکارە بۆ جێ گرتنەوەی بکەر. لە هەموو زمانێکدا ڕستەی بکەر نادیار هەیە، بەڵام هەر زمانێك تایبەتمەندی خۆی هەیە. لە زمانی کوردیدا شێوەی دروستبوونی بکەر نادیار لە بکەر دیارەوە بەم هەنگاوانە دەبێت[1] :

١- بکەری ڕستەو جێناوی لکاوی ڕێکەوتن کە بۆ بکەرەکە دەگەڕێتەوە لادەبرێت.

٢- بەرکار شوێنی بکەر دەگرێتەوە، بەڵام چەمکی بەرکاری خۆی نادۆڕێنی.

٣- ڕەگی کار وەردەگیرێ.

٤- مۆرفیمی بکەر نادیا{ ر } دەچێتە سەر ڕەگەکە.

٥- مۆرفیمی کات بۆ رابردوو{ ا } و بۆ رانەبردوو { یٚ } دەچێتەسەر مۆرفیمی بکەر نادیارەکەوە.

٦- جێناوی لکاو بە پێی کەس و ژمارەی بەرکار کە شوێنی بکەری گرتۆتەوە دەچێتە سەر کارەکە.

[1]- وریا عومەر ئەمین، رۆشنبیری نوێ، ژ٩٥، ١٩٨٢، ل ٢٤-٢٥.

لەم هێڵکاریەدا بە چەند نموونەیەك شێوەی گۆڕینی ڕستەی بکەردیار بۆ بکەرنادیار روون دەکەینەوە:

ڕستەی بکەر دیار:




ڕستەی بکەرنادیار

– خانووەکە فرۆشرا کاتی ڕابردوو

– خانووەکە دەفرۆشرێ کاتی ڕانەبردوو

ڕستەی بکەر دیار




ڕستەی بکەر نادیار

– هاورێکان دەبینرێن کاتی ڕانەبردوو

– هاورێکان بینران کاتی ڕابردوو

**جۆرەکانی ڕستە**

زمانەوانان هەر لەکۆنەوە بۆ مەبەستی ئاسانکردنی لێکۆڵینەوەو دیاریکردنی سنوورو جۆرەکانی بەشێوەی جیاجیا ڕستەیان پۆلین کردوە. هەروەك ئاشکرایە ڕستە لەرووی پێکهاتن و دارشتن و ئەرك و واتاوە دابەش کراوەتە سەر چەند بەشێکی دیاریکراو، ئەم بەشانەی لەزمانی کوردی دا دەست نیشان کراون وەك[1] ڕستە بەپێی پەیوەندی واتاییەوە بۆ هەبوونی ڕاستی رودان و رونەدانی دوو جۆرە، یان لەحاڵەتی ئەرێ دایە، یان لەحاڵەتی نەرێ دایە [2].ڕستە لەرووی پێکهاتن و داڕشتنیشەوە ڕستەی سادەو لێکدراو و ئاڵۆز دەگرێتەوە[3]، لەرووی ئەرك و واتاوەش بۆ چەند جۆرێك دابەش کراوە وەك ڕستەی هەواڵگەیاندن، ڕستەی فەرمان، ڕستەی پرس، ڕستەی سەرسوڕمان........هتد لەرووی ڕێژەوەش بۆئینشائی و ئیلزامی کە(خۆزگە ونیاز ونەگەری و ...هتد)دەگرێتەوە دابەشکراوە[4]. ئێمە لەم بەشەدا بەکورتی باسی هەندێك لەم جۆرانە دەکەین:

**یەکەم/ ڕستە لە رووی پێکهاتنەوە**

ڕستە لە رووی پێکهاتنەوە دەکرێت بەم جۆرانەی خوارەوە:

١– **ڕستەی سادە:** ئەو ڕستانە دەگرێتەوە کە تەنیا یەك کاریان تێدایە، بەگوێرەی کەرەسە سەرەکییەکان و ناسەرەکییەکانیش دوو جۆر ڕستەی سادە لێك جیادەکرێتەوە:

**أ– ڕستەی سادەی ناوك (بنچ)**

ڕستەی سادە ئەو ڕستەیە کە لە سادەترین ڕۆنانیدا لە گرێیەکی ناوی و گرێیەکی کاری پێکدێ، کە هەر گرێیەکیش لەم گرێیانە ڕۆڵێکی سەرەکی لە

---

[1] قەیس کاکل، ١٩٩٦، ل ٣٤.

[2] کوردستان موکریانی، ١٩٨٦، ل٥٤.

[3] عەبدوڵلا حوسێن رەسوول، ١٩٩١، ل٨٦.

[4] ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، ٢٠٠٣، ل٥٧.

ڕستەدا دەگێڕێت، بە واتایەکی تر ڕستەی سادەی ناوك ئەو ڕستانە دەگرێتەوە کە تەنیا لە کەرەسە سەرەکییەکان پێکدێت بوونیان بە خورتییە، بەلأم دەرکەوتنیان بە ئارەزووە. چونکە بکەر (گرێی ناوی) هەندێ جار بە شێوەیەکی ئاشکرا بە دیار ناکەوێت، بەڵکو لە شێوەی ڕاناوێکی لکاودا بە ڕەگی کارەکەوە دەلکێ و زۆرجار لە ژمارەدا لەگەڵ بکەردا ڕێك دەکەوێ. وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

– منداڵەکە کەوت ←——— – کەوت

– پیاوەکە مارەکەی کوشت ←——— – مارەکەی کوشت

– کوشت

– من خانوویەکم فرۆشت ←——— – خانوویەکم فرۆشت

– فرۆشتم

**ب– ڕستەی سادەی فراوانکراو**

مەبەست لە فراوانکردنی ڕستەی سادە خودی کارەکە نییە، چونکە هەموو ڕستەیەکی سادە تەنیا یەك کاری تێدایە[1]، بەڵکو مەبەست لە فراوانکردنی(ڕستەی سادەی ناوك)ە کەبە هۆی چەند کەرەسەیەکی ناسەرەکی فراوان دەکرێن، ئەمەش بە چەند ڕێگایەك دەبێت لە وانە:

١– فراوانکردنی گرێی ناوی(بکەر، یان بەرکار)

– کچەکە هات. (ڕستەی سادەی ناوك)

– کچە جوانە زیرەکە هەژارە بالأ بەرزەکە هات. (فراوانکراو)

– هەندێ گەنجی زۆر چالاك و ژیر ئەم کارەیان کرد. (فراوانکراو)

– ئەوان دوو کتێبی باش و بە سوودیان کڕی. (فراوانکراو)

٢– بە هۆی بەرکاری ناڕاستەوخۆوە فراوان دەکرێ

– من نامە بۆ ئازادی برام و ئاواتی خوشکم دەنێرم.

– ئەم کتێبەم بۆ گەورەو بچووك نووسیووە.

---

[1]– عەبدوڵلآ حوسێن ڕەسووڵ، ١٩٩١، ل٥٢.

٣- بەهۆی ئاوەڵگوزارەوە بە هەموو جۆرەکانیەوە

- دوێنێ شەو لە هەرێمی کوردستان لە شاری هەولێر بەفرو بارانێکی زۆر باری.

٤- بە هۆی هەندێ وشەی(بانگکردن، سەرسوڕمان، جێناوی خۆی کە بۆ پێداگرتن، جەختکردن.... )بەکاردێت . وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- هۆ هۆ کوری چاك وەرە.
- پەککو لەم هەواڵە ناخۆشە !
- ژنەکە خۆی خۆی کوشت.

### ٢- ڕستەی لێکدراو:

ئەو جۆرە ڕستانە دەگرێتەوە کەپتر لە کارێکیان تێدایەو هەرکارێك ڕستەیەکی سەربەخۆ پێك دەهێنێ، بەلاّم بەشدارییەکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە، وەك هاوبەشی لە هەمان گرێی ناوی، چ بکەربێ چ بەرکار، یان بە شداری لە رووی کاتی ئەنجامدانی کاتەکان[1] . ئامرازەکانی لێکدەر ڕۆڵێکی ئاشکرا دەبینن لە پێکەوە بەستنەوەی ڕستەسادەکان. بەلاّم بەشداری لە رۆنانی رستەکان ناکەن و[2] ڕستەکان لە رووی شێوەو واتاوە لە بەستانەوەیاندا هاوکێش و بەرامبەر ڕادەگرن[3] . ئامرازە لێکدەرەکان لە زمانی کوردیدا زۆرن لە وانە (و، بەلاّم، بەڵکو، یان، ش، ئەوسا، یان...یان، نە...نە، .....) ڕستەی لێکدراو بە چەند شێوەیەك پۆلین دەکرێن لە وانە:

ا-بە پێی مەبەست و واتا

ب- بە پێی ئامرازە لێکدەرەکان

ج- بە پێی کات

د- بە پێی ئامرازە لێکدەرەکان و دەمە کاتەکان

---

[1]- عەبدوڵلا حوسێن رەسوول، ٢٠٠٥، ل٤٦.

[2]- عەبدوڵلا حوسێن رەسوول، ١٩٩١، ل٦٦ .

[3]- رەفیق محەمەد محێدین شوانی، ١٩٩٧، ل٤٣.

ئێمە لەم پۆلینەدا ڕستەی لێکدراوبە پێی ئامرازەکان دەخەینە ڕوو، لەوانە:

١- ئامرازی لێکدەری ( و)

- هاتم و دانیشتم.
- نانەکەیان خوارد و ڕۆیشتن.
- چەند فرمێسکێکی گەرم بە چاوما هاتە خوارەوە و هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا.
- بای ساردی خەزان لە سەرخۆ دەهات و دەیدا لە ڕوومدا.

٢- ئامرازی لێکدەری (بەڵام)

- کتێبەکەم بۆ برد بەڵام نەیخوێندەوە.
- خانووەکەمان خۆشە بەڵام بچووکە.

٣- ئامرازی لێکدەری (یان......یان)

- یان دانیشە یان برۆ.
- یان لێرە بنوو یان لە ماڵی ئێمە.

٤- ئامرازی لێکدەری( نە.....نە)

- نە من نانم خوارد، نە باوکم نانی خوارد.
- نە هێندە تاڵ بە فرێ بدرێی نە هێندە شیرین بە قوت بدرێی.

٥- ئامرازی لێکدەری (ش)

- من دێم تۆش وەرە.
- وامن ناویان دێنم، تۆش بە پەنجەکانت بیانژمێرە.

٦- ئامرازی لێکدەری (پاشان، یان ئینجا)

- وانەکە دەخوێنین پاشان دەچینە سەیران.
- زەنگەکە لێدرا ئینجا قوتابیەکان چوونە ژوورێ.

**ڕستەی ئاڵۆز**

ئەو جۆرە ڕستەیەیە، کە لە ڕستەیەکی سەرەکی و ڕستەیەك، یان چەند ڕستەیەکی شوێنکەوتوو پێکدێ[1] .یان دەشێ ڕستەی ئاڵۆز وەك کۆمەڵە پارستەیەك تێی بڕوانرێ کە بە لای کەمەوە لە ڕستەیەکی سەرەکی و پاڕستەیەك، یان چەند پارستەیەکی دیارخەر پێك بێ[2] . ڕستە سەرەکییەکە لە ڕستەی ئاڵۆزدا ڕستەیەکی سەربەخۆیە، بەلام پارستەکان بەندن بە ڕستە سەرەکییەکەوە چەند زانیارییەك لەبارەی توخمێکی ڕستەی سەرەکی لە خۆ دەگرێ. ڕستەی سەرەکی لەم جۆرە ڕستەیەدا بە خورتییە و دەبێ هەبێ، بەلام پارستەکان بە ئارەزووە دەشێ لابرێ بێ ئەوەی ڕستەی نارێزمانی دروست بکات[3] . پارستەکان کە بە هۆی ئامرازەکانی گەیەنەرەوە دەگەیەنرێنە رستەی سەرەکی، ئامرازەکان تێکەڵ بە داڕشتنی پاڕستەکان دەبن[4] .پاڕستە ئەو بەشەیە لە ڕستەی ئاڵۆزدا کەهەر چەندە کەرەسە پێویستییەکانی ڕستەی تێدایە، بەلام ناتوانێ وەك رستەیەکی تەواو سەربەخۆ بوەستێ، بەڵکو لە رووی رێزمانەوە بە ڕستە سەرەکییەکەوە بەندە[5] . لە ڕستەی ئاڵۆزدا پارستەکان جۆری ڕستەکە دیاری دەکەن بە گشتی پارستەکان دەبن بە سێ جۆر لە وانە:

١- پارستەی ناوی

٢-پارستەی وەسفی(دیارخەری)

٣- پارستەی ئاوەڵگوزارەیی

**١- پاڕستەی ناوی:** ئەو پارستانەن کە جێگای ناوێك، یان گرێیەکی ناوی لە ڕستە سەرەکییەکە (شارستە) دەگرنەوە، واتە هەندێ ئەرکی

---

[1] - محمد علی الخولی، ١٩٨٢، ل٥٠.

[2] - ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی، ٢٠٠٣، ل ٨٧.

[3] - خەسرۆ ئەحمەد، ٢٠٠٨، ل١٠٩.

[4] - رەفیق محەمەد محێدین شوانی، ١٩٩٧، ل١٠٩.

[5] - شلێر رەسووڵ محەمەد، ٢٠٠٤، ل٤١٧.

سەرەکی ناو ڕستەی دەدرێتە پاڵ لەوانە ئەرکی بکەری، یان بەرکاری دەبینن. وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

ا- پاڕستەی بکەری

- پێویستە دەست لە هەموو شتێ هەڵگرین.
- ئاشکرایە کە ئەمساڵ دەرناچێت.

ب- پاڕستەی بەرکاری

- بیسترا کە چۆنت هاوارکرد.
- ناتوانم ئەم کارە بکەم.
- دیتی ئەو خێزانە هەموو لە گەڵی باشن.
- هەموو ڕێبوارێکیش نەیدەزانی، کە داپیرە ئایشێ دەرۆزە دەکا.

**٢- پاڕستەی دیارخەری:** وەسفی گرێیەك دەکات لە ناوڕستە سەرەکییەکەدا(شارستە) لایەنێکی ئەو نادیارییە دەردەخات، یان ڕوون دەکاتەوە کە لە گرێیەکەدا هەیە و بە پێی ئەرکی گرێیەکە لە ڕستەدا دەتوانرێت پارستەی دیارخەری بکرێت بەم بەشانەی خوارەوە:

ا- پاڕستەی دیارخەری بکەری

- ئەو قوتابییەی کەباشی دەخوێند بەیەکەم دەرچوو.
- ئەو خێزانەی کە تاوێ لەوەو پێش گەیشتن منداڵێکیان پێ بوو.
- چاوە ڕەشەکانی کە لە ژێر لەچکەکەوە دەبریسکانەوە، نیشانەی پرسیارێکی پڕ لە سەرسامیان دەنواند.

ب- پاڕستەی دیارخەری بەرکاری

- دارا کتێبەکەی دامێ کە دوێنێ کڕی بووی.
- ئەو گوڵەی کەلە هەمووان گەشتر بوو هێنای.
- ئەو چیرۆکەی کە خوشکم وەری گێڕابوو، بڵاوکرایەوە.

ت- پاڕستەی دیارخەری ئاوەڵگوزارەی شوێنی

- ئێمە لە هەولێر دەژین کە پایتەختی کوردستانە.
- کەل و پەلەکان لەو بازارە بکڕە کە تازە دروستکراوە.

ج-پاڕستەی دیارخەری ئاوەڵگوزارەی کاتی

- دوێنێ کە ڕۆژی شەممەبوو بارانێکی زۆرباری.
- شەوانی زستان کە زۆر درێژە هەموو کارەکانمان تەواو دەکەین.

د-پاڕستەی دیارخەری

- کچی پوورەکەم کە خوشکی باوکمە زۆر زیرەکە.
- دەنگی ئۆتۆمۆبێلەکەی کەلە نزیکتانەوە وەستابوو هەمووتانی هێنایەوە سەرخۆ.

**٣-پاڕستەی ئاوەڵگوزارەیی:** ئەو پارستانە دەگرێتەوە کە زیاتر پەیوەستن بەکاری ڕستەکەوە. دەشێ هەموو جۆرەکانی لە گرێی بەندو هەندێ جاریش لە گرێی ناوی پێکبێت کە لایەنێکی واتای ڕستە سەرەکییەکە روون دەکاتەوە لەوانە(کات،مەرج، هۆ، ئەنجام پێوانە، چۆنیەتی.....)کەواتە بە پێی جۆرەکەی دەتوانین پارستەی ئاوەڵگوزارەیی بکەین بەم بەشانەی خوارەوە:

ا- پاڕستەی کاتی

- کەمن هاتم ، ئەو ڕۆیشتبوو.
- کە گەڕامەوە پێت دەڵێم.
- کە خوشکم خۆراکی بەیانی ئامادەدەکرد، هەموو خێزان لە خەو هەڵستابوون.
- کە ئێوارە داهات، هەموو خەڵکەکە لەبەر ئاگرەکەی ئێمەدا کۆببونەوە.

ب- پاڕستەی مەرجی

- ئەگەر نەخوێنی دەرناچیت.

- ئەگەر ماڵت لە شووشەبوو ماڵی خەڵك بەرد باران مەكە.

ت- پاڕستەی هۆ

- بەپێ هاتم بۆیە دواكەوتم.
- بۆ مەبەستی خۆیان هەموو شتێ دەكەن.

ج- پاڕستەی ئەنجام

- یەك ناگرین، بۆیە سەرناكەوین.
- ماوەیەكە ئەم دیوە بۆیە ناینناسمەوە.

د- پاڕستەی پێوانە

- ئەوەندە شیرینە دەڵێی شەكرە.
- كوردستان ئەوەندە خۆشە باسی ناكرێ.

هـ- پاڕستەی چۆنیەتی

- كێشەكە وەك من بۆی دەچم ئاسان نییە.
- بەوردی بگەڕێ بەم شێوەیە قەڵەمەكە دەدۆزیەوە.

**دووەم/ ڕستە لە رووی ئەركەوە**

هەندێك لەرێزماننوسە دێرینـەكان سـێ جـۆر ڕسـتەیان لـەرووی ئەركـەوە دەسـت نیشـان كـردوە لەوانـە (ڕسـتەی بـەیانی ڕسـتەی پـرس و ڕسـتەی فەرمانی)[1] هەندێكی تریشیان بەگشتی چـوار جۆریـان جیاكردۆتـەوە ئـەویش (ڕسـتەی هەواڵگەیانـدن و ڕسـتەی فـەرمان و ڕسـتەی پـرس و ڕسـتەی سەرسورمان)[2]. لەم ساڵانەی دواییدا زۆربەی زمانەوانەكان ئەم جۆرە ڕستانە دەكەن بەحـەوت جـۆرەوە (زانیـاری و هەواڵگەیانـدن، پرسـیاركردن، هەسـت دەربرین، ورووژاندن، فەرمانـدان، ڕاپەرانـدن و جـێ خۆشـكردن[3]). هەنـدێكی تریشیان بێجگە لەم جۆرانە باس لە جۆری تر دەكـەن وەك سـوێند خـواردن،

---

[1] توفیق وەهبی، ١٩٢٨، ل ٨.

[2] كوردستان موكریانی، ١٩٨٦، ل ٥٤ .

[3] محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٠، ل٢٦.

پارانــەوە (دوعــا کــردن)، بانگکردن.....هتــد. دابەشــکردنی ڕســتە بــۆ هەواڵگەیاندن و پرس و فەرمان و سەرسوڕمان و...... پەیوەندیـەکی پتـەوی بە مۆداڵکارییەوە هەیە، واتە ئـەم دابەشـکردنە لـە ڕوانگـەی قسـەکەرەوەیەو لەم جۆرەدا قسەکەر تێڕوانینی خۆی بـۆ دەوروبـەر و هاوبەشـەکانی گـوتن و نامەکـەی کـە دەیـەوێ بیگەیـەنێت دەردەبڕێ.لـە خـوارەوەدا هەنـدێك لـەم جۆرانە دەخەینە ڕوو:

**١- ڕستەی زانیاری و هەواڵگەیاندن:**

لـەم جۆرەیانـدا قسـەکەر خـۆی دەکـات بەشـایەت و جـەخت لەسـەر دروستی نامەکە، یان هەواڵەکە دەکات و گوێگر دڵنیـا دەکـات کـە گوتنەکـە دروستەو ئەو دڵنیاییە لە ڕاستی نامەکە دەردەکەوێ.بە واتایەکی تر قسەکەر سەرچاوەی زانیارییەو زانیارییەکە دەدات بـە گـوێگر و کاردانـەوە لـە گـوێگر ڕوونادات تەنیا زانیارییەکەی پێ دەگات. ڕستەی هەواڵگەیاندن بنچینەیە بـۆ دروستکردنی هەموو جۆرە ڕستەیەك، واتە جۆرەکانی تری ڕسـتە لـەم جـۆرە ڕستەیە دادەڕێژرێت . لەم جۆرە ڕستەیەدا بە زۆری(بکەر) بەشی پێشـەوەی ڕستە دەگرێ.وەك لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ.

- جوتیار زەوی دەکێڵێت.
- میوانەکان دوێنێ گەیشتن.
- گەرما لەگەڵ مانگی گوڵاندا دەست پێ دەکات.
- کاتێ گەیشتمە قوتابخانە، قوتابییەکی زۆر لە گۆڕەپانەکە ریزببون.
- ئێمە هیچ هەواڵێکمان لەو بارەیەوە پێ نەگەیشتووە.

**٢- ڕستەی پرسیار:**

مەبەست لە پرسیارکردن دەسـت خسـتنی زانیارییـە. لـە ڕسـتەی پرسـدا گـوێگر بـە سـەرچـاوەی زانیـاری دادەنرێـت، چـونکە قسـەکەر زانیـاری لانیـە دەیەوێ بە هۆی پرسیارکردنەوە ئەو زانیارییانـە بـە دەسـت بێنـێ. لـەزمانی

کوردیدا چەند جۆرێك لە ڕستەی پرسیارمان هەیە، لەوانە هەڵبژاردن، کلکە پرسیار،...[1] بەڵام بڵاوترینیان پرسیاری گشتی و پرسیاری تایبەتیە .

**پرسیاری گشتی/** یان بە (ئا) یان بە(نا) یان بە ئاوەڵکارێکی تر وەڵام دەدرێتەوە. پرسیاری گشتی لە کوردیدا بە دوو ڕێگا دروست دەبیّ:

ا- بە بەکارهێنانی هەندیّ ئامرازی وەك (ئەریّ؟ یان ئایا؟). وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- ئەریّ قوتابیەکان دێن؟
- ئایا قوتابیەکان دێن؟

ب-بەبەکارهێنانی ئاواز : ئەم جۆرەیان لە رووی ڕێزمانەوە لە شێوەی ڕستەیەکی هەواڵداندایە کەچی لەرووی فۆنۆلۆجیەوە جیاوازە وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- ئێوە دەڕۆن؟
- قوتابیەکان راپۆرتەکانیان نووسی؟
- نانتان خوارد؟

**پرسیاری تایبەتی/** لەم جۆرەیاندا پرسیار لەبارەی یەکێك، یان زیاتر لە کەرەستەکانی ڕستەکە دەکریّ، ئەمانە زۆرجار بە ئامرازی پرس دەست پیّ دەکەن. وەك:

- کەی هاتن؟
- کیّ کارەکەتان بۆ دەکات؟
- لەکویّ دەژی؟
- چی دەخۆن؟
- بەچەند فرۆشتی؟

---

[1]- ئەبوبەکر عومەر، ١٩٩٠، ل١٨.

**پرسیاری هەڵبژاردن/** ئەو ڕستەیەیە کە تێیدا دوو مەبەست، یان دووشت، یان زیاتر ڕادەگەیەنرێت و بواری دوێنراو دەدرێ کە یەکێکیان هەڵبژێرێت بە هۆی ئامرازی لێکدەری (یان) دروست دەبێ[1]. وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- دادەنیشی، یان دەڕۆی؟
- ژیرە، یان دەبەنگ؟
- زێرە، یان زیو؟

**کلکە پرسیار /** ئەم جۆرەیان پرسیارێکی کورتکراوەیە قسەکەر(دوابەدوای ڕستەیەکی ڕاگەیاندن ئاراستەی گوێگری دەکات، تا لە بیرۆکەی ڕستەکە دڵنیابیت، یان ئەو مەرامەی هەیەتی بیپێکێت)[2] . وەك:

- تاقیکردنەوەکە ئەمڕۆیە، وانییە؟
- دەڵێن لە چین دروستکرایە، وایە؟
- دەمەوێ بتانبینم، باشە؟

## ٣- ڕستەی فەرماندان:

ئەم جۆرە ڕستەیە یەکێکە لە جۆرەکانی ڕستەی داخوازی کە قسەکەر داوا لە کەسی دووەم دەکات کارێك بکات، یان هەڵوێستێك بنوێنێت، یان بە پێچەوانەوە بۆ قەدەغەکردنی کارێك بەکار دەهێنرێت. بە شێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە ڕستەیە بە هۆی کاری ڕستەکەوە دروست دەبێت[3].وەك:

- برۆ نانێك پەیدا بکە.
- هەوڵ بدەن قەڵاچۆی ئەم دەردەبکەن.
- ئاگاداری منداڵەکان بە.
- دەست لە کتێبەکان مەدەن.

---

[1]- رەفیق محەمەد محێدین شوانی، ١٩٩٧، ل٤٤.

[2]- ئەبوبەکر عومەر، ١٩٩٠، ل١٨.

[3]- قەیس کاکل، ١٩٩٦، ل٢٧.

### ٤- ڕستەی هەست دەربڕین (سەرسوڕمان):

ئەم جۆرە ڕستەیەیە کەقسەکەر بەرامبەر دیاردەکانی دەوروبەری هەست و ئارەزوو باوەری دەردەخات سادەترین جۆریشی لەو گوتنانەدا دەردەکەوێ کە وشەی سەرسوڕمانی تێدایە[1] وەك:

- وای لەم دەردە ترسناکە!
- ئۆخەی کە خوێندنم تواوکرد!
- سەیری کە، چەند جوانە!

### ٥- ڕستەی بانگکردن:[2]

ئەم جۆرە ڕستەیە ڕێگاییێکە بۆ بانگکردنی یا ئاگادارکردنەوەی کەسێ، کە قسەکەر واتە بانگکەر دەیەوێت هەواڵێکی پێ ڕابگەیەنێ بە هۆی بەکارهێنانی هەندێ ئامراز کە بە پێی مەبەستی بانگکەر لە بانگ کردنەکەدا بەکاردێت بۆ سەرنج ڕاکێشانی بانگکراو. ئەم جۆرە ڕستەیە بەهۆی بانگکراو و ئامرازی بانگ کردنی وەك ( هۆ، ئەی، هێ،ە، ێ....) لە ڕستەکانی تر جیا دەکرێتەوە وشێوەی سەربەخۆی دەبێت. بانگ کردن لە زمانی کوردیدا بە چەند شێوەیەك ئەنجام دەدرێت لەوانە: پرسیارکردن،فەرماندان، هەواڵگەیاندن.....هتد بە شێوەیەکی گشتی شوێنی بانگکراو دیاری کراوە ئەویش دەکەوێتە دوای ئامرازی بانگ کردنەوە ئەگەر ڕستەکە ئامرازی لە گەڵبوو، بەڵام ئەگەر ئامرازەکان نەوترابوون ئەوا خۆیان بە تەنیا دێن لە ڕستەکەدا.وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

- هۆ هۆ خەڵکینە مەترسییە.
- ئەی هاوار فریامان بکەون.
- بابە، بابە میوان، میوانمان هاتووە.
- کچێ کچێ لەگەڵ تۆمە.
- ئازاد ئازاد ئاگات لە خۆت بێ.

---

[1]- محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٠، ل٢٨.

[2]- د.ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی و د.شلێر رەسوول.

٦–ڕستەی پاڕانەوە(دوعاکردن):

ئەم جۆرە ڕستەیە یەکێکە لە باوترین شێوازەکانی داخوازی کە تێیدا قسەکەر ڕاستەوخۆ رووی دەمی خۆی دەکاتە کەسی دووەم کە خوایە، کارێکی بۆ ئەنجام بدات، یان ئەنجام نەدات ئەویش بە ناوهێنانی، یان بە یەکێك لە سیفاتەکانی وەك (خوایە، یاخوا، ئەی خوایە، ڕەبی....) داوای لێ دەکات، بە زۆری لەناوڕستەدا ئەم وشەو گرێیە تایبەتیانە دەچنە سەرەتاوە. ئەم جۆرە ڕستەیە ڕاستی و هەڵەی تێدانییە، چونکە داواکردنەو زانیاری گەیاندن نییە، لە ڕستەی پاڕانەوەدا هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوە کە هێزو وزەی تێدا بەکاردێت لە وانە (کردن، یارمەتی دان هێنان، ناردن، ئاشکراکردن......). بە شێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە ڕستەیە بۆ دوو مەبەست بەکاردێت ئەویش لایەنی خێرو چاکەیە (دوعا بۆکردن) یان لایەنی خراپەو شەڕە (دوعا لێکردن).وەك:

- یا خواماڵتان هەر ئاوەدان بێت.
- خوایە بیخەیتە سەر ڕێی ڕاست.
- یاخوا لەوە گێل ترت بکات.
- ڕەبی مووی لێ بێ زمانی.
- ڕەبی لە گەری نەچێتە خوار.

ڕستەی پاڕانەوە لە زمانی کوردیدا بە چەند جۆرێ دەردەبرێت لەوانەجۆری سەرسووڕمان، پرسیار، بانگکردن، داواکردن و تکاکردن....... وەك

- خوایە بارانمان بۆ ببارێنە.
- خوایە لێمان خۆشبە.
- رەبی باوانت شێویٚ بۆ وادەکەی؟
- خوا لەناو دەمت بدا چ منالێکی!

## ٧- ڕستەی سوێند خواردن:

ئەم جۆرەیان بریتیە لە سوێند خواردنی کەسی سوێند خۆر کە تیایدا جەخت لە سەر شتێك دەکا و باسی دەکا بە ئەریێ، یان نەریێ، ئەو ڕستەیە جەخت کردنەوەیە لە سەر ڕستەیەکی تر. واتە ڕستە جەخت کراوەکە سوێند لە سەر خوراوەکەیە و زۆربەی کات ئەم جۆرە ڕستەیە ڕستەی هەوالگەیاندنە، هەندێ جاریش ڕستەی داخوازیە. ڕستەی سوێند خواردن لە زمانی کوردیدا لەرووی پێکهاتنەوە لە جۆرەکانی تری ڕستە جیاوازە بەوەی کە کارەکانی بریتین لە (سوێند خواردن، سوێند دان، قەسەم،....) واتە لەرووی ڕۆنانەوە پێویستی بەم کەرەستانە هەیە (بکەر(سوێند خۆر)، کار، مۆرفیمی سوێند خواردن،گرێی بەند(سوێند پێ خوراو)، مەبەستی سوێند(سوێند بۆ خوراو))وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- سوێندت بۆ دەخۆم هەتا بمێنم
  ئەو ڕازە لەکن کەس نەدرکێنم. (هێمن ل٨٨)

- بە خوا ئیشی وام نەکردووە.
- وەڵلاهی تەواومان کرد.
- بەخوا نەمردووە.

## ٨- ڕستەی ڕاپەڕاندن:

ئەرکی ڕاپەراندن لەو ڕستانەدا دەردەکەوێ کە خۆیان بریتین لە ڕاپەڕاندنی کارێك، بە واتای ئەوەی لە جیاتی ئەوەی قسەکەر کارێك بە گوێگر ڕاپەڕێنی خۆی کارەکە ڕادەپەڕێنێ و گوتنەکەش ڕاپەرانـدنی کارەکەیە.نموونە لەبارەی ئەمجۆرە ڕستەیە زۆرە وەك:

- بەڵێن دەدەم ئەو کارەت بۆ بکەم.
- وا ئەم کۆبوونەوەیە دوایی پێ دێنم.
- سوێند دەخۆم ڕاست بڵێم.
- پەیماندەدەم لای کەس نەی درکێنم.

ئەو ڕستانەی ئەرکی ڕاپەڕاندن دەنوێنن چەند تایبەتییەکیان تێدایە وەك:

١- بکەری کارەکە ئاسایی کەسی یەکەمی تاك، یان کۆیە وەك: من /ئێمە.

٢- ئەو کارانەی لەم جۆرە ڕستانەدا دەبینرێن کۆمەڵێکی دیاریکراوی داخراون وەك: ناونان، بەڵێندان، پەیماندان، گفتدان....هتد)

**٩- ڕستەی جێ خۆشکردن:**

ڕستەی جێ خۆشکردن لەو ئەرکانەیە کە زۆر بڵاوە و لە هەموو زمانێکی سروشتیدا هەست بە بوونی دەکرێ ئەم ئەرکە زیاتر لەو گوتنانەدا دەردەکەوێ کە ڕۆژانە بەکاردێ و بەسەر زاری هەموو کەسێکەوەیە بۆ مەبەستی خۆ بردنە پێشەوەیەو بارو شوێن خۆشکردن و خۆچەسپاندن لە ناو کۆمەڵگای مرۆڤدا وەك ئەو ڕستانەی بۆ سڵاوکردن و خواحافیزی و چاك و چۆنی بەکاردێت بۆ نموونە:

- چاکی؟ چۆنی؟ باشی؟
- بەیانی باش، شەو باش، ...
- سوپاس،...
- خوا حافیز، خوات لەگەڵ،...

ئەم ڕستانە هەر چەند زۆربەیان لە شێوەی پرسیاردان، لە ڕاستیدا بۆ پرسیارکردن نایەن، بەڵکو قسەکەر بۆئەوە بەکاریان دێنی کە خۆی لە گوێگر نزیك بکاتەوەو شوێنی خۆی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بچەسپێنی...[1]

[1]- محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٠، ل٢٧.

## سەرچاوەکان


١- ئاواز حمه سەدیق/ ریزبوونی کەرەستە لە زمانی کوردییدا/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٩٦.

٢- ئەحمەد حەسەن فەتحوللا/ بکەر وەك بە شێکی سەرەکی ڕستە لە زمانی کوردیدا/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٩٠.

٣- حاتەم وەلیا محەمەد/ فرێزی ناوی وفرێزی کاری لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی زمان/ زانکۆی سلێمانی/ ٢٠٠٠.

٤- خەسرۆ ئەحمەد خۆشناو/ بەرکار لە زمانی کوردیدا/ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری/ هەولێر/ ٢٠٠٨.

٥- رەفیق محەمەد محێدین شوانی/ ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا/ نامەی دکتۆرا/ کۆلێجی پەروەردە- ئیبن روشد/ زانکۆی بەغدا/ ١٩٩٧.

٦-ساجیدە عەبدوللا فەرهادی/ ڕێزمانی بەندێتی و هەندێ لایەنی ڕستەی کوردی/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٩٤.

٧- ساجدە عەبدوللا فەرهادی/ ڕستەو پاش ڕستە -تێروانینێکی ئەرکی/ نامەی دکتۆرا/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ٢٠٠٣.

٨- شلێر ڕەسووڵ محەمەد بەرزنجی/ ئاوەڵگوزارە لە زمانی کوردیدا/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٨٩.

٩- شلێر ڕەسووڵ محەمەد بەرزنجی/ یاساکانی دارشتنی لاڕستەی دیارخەری لە زمانی کوردیدا / نامەی دکتۆرا/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ٢٠٠٤.

١٠- تاڵیب حوسێن عەلی/ هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستەو واتا لە کوردیدا/ نامەی دکتۆرا/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٩٨.

١١-عەبدوڵلا حوسێن ڕەسووڵ/ ناکردن لە کوردیدا / نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٩١.

١٢- عەبدوڵلا حوسێن ڕەسووڵ/ پوختەیەکی وردی رستەسازی کوردی/ کتێبی گیرفان/ وەزارەتی رۆشنبیری/ هەولێر/ ٢٠٠٥.

١٣- فەرەیدون عەبدول محەمەد/ نادیاری/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٨٨.
١٤- ڤیان سلێمان حاجی/ رێککەوتن لە شێوەی ژووروی زمانی کوردیدا/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ٢٠٠١.
١٥- قیس کاکل/ تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماجستێر/زانکۆی سەلاحەدین/١٩٩٦.
١٦- کاروان عومەر قادر/ رستەی باسمەند لە زمانی کوردیدا - بەکەرەستەی دیالێکتی کرمانجی خواروو/ نامەی ماستەر/ کۆلێژی زمان/ زانکۆی سلێمانی/ ٢٠٠٦.
١٧- محەمەد مەعرووف فەتاح/ زمانەوانی/ چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٩٠.
١٨- محەمەد مەعرووف فەتاح/ نووسەری نوێ/ ژ١٩/ ٢٠٠١.
١٩- محەمەد عومەر عەول/ کردەی تەواوکردن لە کرمانجی خوارووودا/ نامەی دکتۆرا/ کۆلێجی زمان/ زانکۆی سلێمانی/ ٢٠٠٨.
٢٠- مەحموود فەتحوللا ئەحمەد/ کار تەواوکردن لە کوردیدا/ نامەی ماستەر/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر/ ١٩٨٨.
٢١- وریا عومەر ئەمین/ چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی/ دەزگای ئاراس/ هەولێر/ ٢٠٠٤.